




**چرپەیەک بەگوێی کچاندا**

نووسینی: د.حەسان شەمسی پاشا

وەرگێڕانی: لەیلا عەلی عەبدولعەزیز

بابەت: پەروەردەی گەنجان

نەخشاندن: کتێبخانەی گەشە

تایپ: خیام کەمال

نۆبەی چاپ: یەکەم، ٢٠٢٠

تیراژ: ١٠٠٠دانە

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارە سپاردنی (١٢١٢)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە..

# چرپەیەک بەگوێی کچاندا

نووسینی:

الدکتور.حسان شمسی پاشا

وەرگێڕانی:

لەیلا عەلی عەبدولعەزیز

# پێشەکی

کاتێك ئامارە تازەکان ئاگادارمان دەکەنەوە، کە لە یەکێ لە وڵاتە عەرەبییەکاندا، ٤٥٪ گەنجان لە قۆناغی دواناوەندیدا لانی کەم بۆ یەکجاریش بێت (سێکس)یان کردووە، یان مەی و ماددەی هۆشبەریان بەکارهێناوە، کاتێك ئەو ئامارە تووشی شۆکمان دەکات، کە لە پایتەختی یەکێك لە وڵاتە عەرەبییەکاندا ڕێژەی جیابوونەوە گەیشتۆتە ٥٠٪، واتە لە هەر (دوو) هاوسەرگیری یەکێکیان لێك هەڵدەوەشێت و جیادەبنەوە. کاتێك دەبینین کوڕ و کچە لاوەکانمان (٢٤) کاتژمێر ئێشکگرن لەبەردەم کەناڵەکانەوە، کە هەر هەمووی گرتە و کلیپی نائەخلاقی و فیلم و زنجیرەیە لەسەر ژیانی کوڕ و کچ پێکەوە، بەبێ هیچ بەڵگەیەکی شەرعی، کاتێك لە ڕاگەیاندنەکان دەبینین هەق و باتڵ تێکەڵکراون، بەڵکوو ئەوەی بەتاڵە و فەسادە لەژێر ناوی ڕۆشنبیری و ئازادی و شارستانی ڕەواجی پێ دەدرێت و لە پێش چاوی بینەر جوان دەکرێت.

تەواوی شاشەکان و لاپەڕەکان و کەناڵە بیستراوەکان شتانێك نمایش دەکەن کە سەر دەکێشێ بۆ لەناوبردنی گەنج و پەلکێشکردنیان بۆ شتی بێ نرخ و ڕووکەش تا ئەو کاتەی ڕۆدەچن، لە شەهوەت و



ئارەزووی دونیایی و لە کۆمەڵگەیەکی ون و بێسەروبەردا لەدەستمان دەچن، کوڕ و کچە لاوەکانمان بێ شوناس و بێ ئایندە بە دەروونێکی شێواوەوە لە شەقامەکاندا دێن و دەچن، ئەمەش وا دەکات کۆمەڵگەیەك دروست بێ شەهامەتی پیاو و حەیا و شەرمی ئافرەت تیایدا هیچ بەهایەکی نەبێت، هەمووی لە زەلکاوی هەڵە و بێ بەهاییدا هەنگاو بنێن.

کاتێك خێزان ئافرەتێکی نەزان و نەشارەزای لە دینەکەی پێگەیاند، کە هیچ لە ژیان نەگەشتبێت، ئەوە نەبێ دەموچاوی ڕەنگ بکات و شوێن مۆدێل بکەوێ بۆ ئەوەی قسەکانی سەرنج ڕاکێش بن، وشەی بێگانە بەکاربێنێت، بێگومان ئەم دایکە جگە لە خستنەوەی نەوەیەکی نەشارەزا و نەزان لە بەها باڵاکان هیچ بەرهەمێکی نابێت، نەوەیەك بێ شوناس کە توانای هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی نەبێت، جا نەگبەتی ئەوەیە ئەمانە ببنە سەرکردە و دەم ڕاستی ئەم ئوممەتە و کاروباری بگرنە دەست، کە بە نموونەی ئەمانە ئوممەتمان لە دەست دەچێ و شارستانییەتمان خاپور دەبێت.

کاتێك دایك وشەی دایکایەتی لەخۆی دادەماڵێ پەروەردەی مناڵەکانی دایە دەست (خزمەتکار)، ئەو نان و ئاوی بداتێ جلوبەرگی بگۆڕێ و شەو و ڕۆژ لە باوەشی بگرێ و گۆرانی بۆ بڵێ و بیلاوێنێتەوە، ئیتر نە کەسێك هەیە بە مانای دایك و نە باوکێك مانای دەمێنێت.

کاتێك دەبینین ئەوەی پێی دەوترێت (جیلی خزمەتکارەکان) نەوەیەکی سەرگەردان، نەزانێ دایك و باوك شەو و ڕۆژ لە کوێ

بەسەردەبەن؟ نەزانیٚ چ دین و ڕێبازێکی هەیە، خزمەتکار چۆنی بویٚ وا پەروەردەی دەکات، ئەوە ئەو کاتەیە قیامەت دەبینین بە چاوی خۆمان! بەڵام خۆشبەختانە لە بەرامبەر ئەمانەدا نەوەیەك هەیە تەسلیم نابێت، وەستان و بەرەنگاربوونەوە بەرامبەر بەتاڵ ڕادەگەیەنێت، پابەند بە ئیسلامە پاك و ڕاست و ڕەوانەکەی خۆیەوە و هیچ تێکدەر و خراپەیەك نایجولێنێت، ئەم نەوەیە جێی هیوا و ئومێدە، ئەمە ئایندەیە، ئەمە پێویستی بە پەروەردە و چاودێری هەیە.

بێگومان کچ لە قۆناغی هەرزەکاریدا بە چەند گۆڕانکارییەکی جەستەیی و دەروونیدا تێدەپەڕێت، کە کەسێتی و مێینەیی تێدا دروست دەبێت.

لە ڕووی سۆز و هەڵسوکەوتەوە بە دۆخێکی پڕ لە دڵەڕاوکیٚ و دووڕەنگیدا دەڕوات، یاخی دەبیٚ لە واقیع و لەو مامەڵەی خێزانەکەی لەگەڵیدا دەیکات. حەزی کاردانەوە لای زیاتر دەبێت، زوو هەڵدەچیٚ و پەشیمانە لە هەڵسوکەوتی، لەوانەیە ئەم ڕەفتارانە لەم قۆناغەدا ساڵانێك بخایەنێت، بۆیە لەم قۆناغەدا پێویستی بە مامەڵەیەکی تایبەت و چاودێری و دڵڕاگرتنی زیاترە.

کەواتە ئەو دایکە هۆشیارە کە دەرکی کچەکەی بکات بە چ قۆناغێکی هەستیاردا تێپەڕدەبیٚ زیاتر لێی نزیك دەبێتەوە و وەکوو هاوڕێیەك مامەڵەی لەگەڵ دەکات، نهێنییەکانی دەپارێزیٚ و هەمیشە بە ئامۆژگاری دینی و فێرکردنی ڕەوشتی جوان ئەزموونەکانی زیاتر دەکات.

دایکی دانا و ژیر بە نەرمی و لەسەرخۆ ئامۆژگاری کچەکەی دەکات، لە دوورەوە چاودێری دەکات، سەرزەنشتی دەکات، بەڵام سزای نادات، وەك دوو هاوڕێ قسەی لەگەڵ یەکدی دەکەن و سورە لەسەر ڕێزگرتن و نرخاندنی هەستەکانی، وردەوردە تێی دەگەیەنێت کە ئەو ئیتر بەرپرسە لە خۆی و ئەرکە شەرعییەکانی لەسەرە، پێویستە خۆی داپۆشێ و جلوبەرگی پۆشتە لەبەربکات، هەڵسوکەوتی ژیرانە بێ و بە ئەدەبەوە ڕەفتار بکات، چونکە ئیتر منداڵەکەی دوێنێ نییە.

بێگومان ئەو پەروەردە ئیمانییەی کچی هەرزەکار لە قۆناغی منداڵیدا وەریدەگرێت، لە دواییدا خێر و فەڕی زۆر دەداتەوە بۆ ژیانی خۆی و دەوروبەری.

لەم تەمەنەدا کچان دەکرێنە ئامانجی ڕاگەیاندنە گومڕاکەرەکان و زۆرترین بانگەوازی هەڵخەڵەتێنەر ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، هەموو میدیا و کەناڵەکان دەخرێنە کار بۆ بەلاڕێدابردن.

لێرە حەقمانە بپرسین، بۆچی ئەوەندە مکوڕانە داوا لە ئافرەتی موسڵمان دەکرێ ئازاد بێ؟ پێویستی بە ئازادییە؟! ئایا پۆشینی حیجاب و خۆپارێزی لە نیگا ئاگراوییەکان بەندایەتییە و پێویستە خۆی لێ ئازاد بکات؟!

ئایا ئافرەت لە ماڵەوە کاتی خۆی بۆ پەروەردەی منداڵەکانی تەرخان بکات و بە شێوەیەکی جوان و چاك و پاك پێیان بگەیەنێت بۆ کۆمەڵگە، ئەمە کۆت و بەندە و پێویستە خۆی لێ قوتار بکات و ئازاد

بێت؟! بۆچی ئەوەندە بە حەسرەتەوەن ئافرەتی پاکداوێن و سەربەرز، بە ڕووتی و بەرەڵایی بێتە سەر شەقامەکان؟!

## ١- بۆ ئەم قسانە دەدرێ بە گوێی کچەکانماندا؟! هەرگیز بەم قسانە سەرسام مەبە:

١. چونکە دایکی ئایندەیە و پێگەیەنەری نەوەی داهاتووە.

٢. هەمیشە وا بخەنە مێشکت کە تۆ ستەملێکراو و سەرشۆڕیت، بۆیە زۆرێك بە شان و باڵتدا هەڵدەدرێت، شاعیر هەڵبەست و پەخشانەکانی تەرخان دەکات بۆت، ڕۆژنامەنووس پێنووسەکەی دەخاتە خزمەتت، هەمووی دەیانەوێت لەسەر مافی کچ قسە بکەن، لەبارەی پرسی ژنەوە بنووسن.

٣. ئافرەت ئەو کەسەیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە چاودێریکردن و گرنگی پێداندا هەمیشە لە پێشەوەی داناوە، هەموو جەژنێك کاتێك لەگەڵ موسڵمانان کۆدەبوویەوە و وتاری بۆ دەدان پاشان بە تایبەت دەچووە لای ئافرەتان و ئامۆژگاری دەکردن و قسەی لەگەڵ دەکردن، بەڵام ژنان زیاتر حەزیان دەکرد لە خزمەتیدابن بۆ زیاتر شارەزابوون و سود وەرگرتن لە ئامۆژگارییەکانی، بۆیە عەرزیان کرد کە ڕۆژێکی تایبەت بە خۆیان بۆ تەرخان بکات، تا بەس خۆیان وەك ئافرەت کاتیان هەبێ و سودی لێوەرگرن، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داواکارییەکەی بەجێهێنان، هەروەك لەو ڕۆژەوە بەڵێنی



پێدان لە هەفتەیەکدا ڕۆژێك بۆ ئافرەتان بوو، لە خزمەتیدا وانە و ئامۆژگاری و پرسیارە شەرعییەکانیان تاوتوێ دەکرد.

ئایا لە وەسیەت و ئامۆژگارییەکانیدا پرسی ژن لە پێش هەموو شتەکانی ترەوە نەبووە و گرنگی پێداوە؟ لە (حجة الوداع)دا حەجی ماڵئاواییدا دەفەرمووێ: (فاتقوا الله في النساء، فإنكم أخذتموهنّ بأمان الله، واستحللتم فروجهنّ بكلمة الله). رواه مسلم.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مامەڵەی پیاوانی لەگەڵ خێزان و هاوسەرانیدا کردۆتە پێوەر بۆ باشی و چاکی پیاوان (خيركم خيركم لأهله وأنا خيركم لأهلي). رواه الترمذي. واتە: (باشترینتان ئەوەیە لەگەڵ ماڵ و خێزانیدا باش بێت، وە من باشترینتانم بۆ ماڵ و خێزانم).

ناو و ڕێزی ئافرەت تەنها ئەمە نییە، بەڵکوو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یەك لەشکری وەستاند تەنها لەبەرئەوەی خاتو عائیشەی خێزانی (سەلامی خوای لەسەربێت) ملوانکەکەی ون کردبوو، تا (أبو بکر) (سەلامی خوای لێبێت) هات و پێی وت: تۆ پێغەمبەر و ئەم خەڵکەت وەستاندووە؟ نە ئاو هەیە، ئێمە ئاومان پێ ماوە، کە وشترەکە هەستا ملوانکەکەی لە ژێردابوو، لەم کاتەدا ئایەتی (تەیەموم) دابەزی، لەبەرئەوەی دواکەوتن و ئاویش نەبوو بۆ دەستنوێژ، خوای گەورە بۆی ئاسانکردن و حوکمی تەیەموم بەم شێوە دانرا، (أسيدين حضير) وتی: ئایا ئەمە بە فەڕ و بەرەکەتی ئێوە نەبوو ئەی آل أبوبکر؟

ڕێز و پێگەی ئافرەت لای پێغەمبەر ئەوەندە بەرزبوو، کاتێك (أم هانئ) (سەلامی خوای لێبێت) دێتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەڵێ: (ئەی پێغەمبەری خوا علی برام (علی کوڕی أبو طالب)، دەیەوێ ئەو پیاوە بکوژێ کە من پەنام داوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: (قد أجرنا ما أجرت يا أم هانئ). رواه مسلم.

واتە: (ئەوا ئێمەش پەنای ئەومان دا کە تۆ پەنات داوە یا (أم هانئ)).

٤. لەبەرئەوەی دایك مەزنە بەو مەزنییەی ئافرەتە و دایکی پیاوە گەورە و زانا و پیاو چاکانە، ئایا ئەوە ئافرەت نییە دایکی شافیعی و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و ئیبن تەیمییە و ئەبو حەنیفە و ئیمامی مالیك و ئەحمەد و چەندانیتر. بزانە هەموو ئەم پیاوانە و چەندانیتر هەر یەکێکیان خاوەنی دایکێکی چاك و ڕاستگۆ و لەخواترس بوون، هەمیشە نزایان کردووە ڕۆڵەی باشیان ببێ و ببنە ڕۆشنایی چاوەکانیان و ئاوەدانی ڕێبازی ئیسلام.

ئایا هەموو ئەم گەورەیی و گرنگییەی ئافرەت بەس نییە بۆ ئەوەی ئەم قسانە بۆ کچان بێت؟

ئایا ئەوە کچ نییە کە شاعیری گەورە حافظ ئیبراهیم لە وەسفی دا دەڵێ:

(الأم مدرسة إذا أعددتها أعدت شعبًا طيب الأعراق).

واتە: ( دایك قوتابخانەیە ئەگەر بە باشی ساز و ئامادەت کرد، ئەوا گەلێکی بنەچە پاکت ئامادە و ساز کردووە).

چەندەها کچ لە دایك و باوکێکی ڕەوشتبەرز و چاك لەدایکبوون، لە ماڵێکی پارێزراودا پەروەردەکراون، بەڵام بە کاریگەری فیتنەی سەردەم و ئەو بەرنامە و بڵاوکراوانەی لە میدیاکانەوە دەیبینن و دەیبیستن بەلاڕێدا چوون، تەلەفۆنەکەی هەڵدەگرێ و قسە لەگەڵ کوڕێکدا دەکات کە نە دیویەتی و نە دەیناسێت، تەنها بە قسە نەبێ، یا لەسەر ئینتەرنێت شەو و ڕۆژ گفتوگۆ لەگەڵ گەنجێکی بێگانەدا دەکات، کە نە ناو و نە هیچی لە بارەوە دەزانێ.

ئەمە بەردەوام لە نێو ململانێ و کێشمەکێشدا دەژی، لەلایەك ئەو دەنگە نەشازە دەبیستێ کە بانگی دەکات بۆ ڕۆچوون لە تاوان و گوناهباری و وازهێنان لە هەموو مانایەکی پاك داوێنی، لەلایەکی تریشەوە ئەو دەنگە ڕاستەی بەتوندی لە ناخەوە دەیهەژێنێت و وەك ئەوەی پێی بڵێ: ئاگاداربە ئەوە ڕێگای ئارەزووپەرستی و بەهیلاکچوونە. بەم شێوەیە ئەو دەنگانە هەمیشە لە ناخیدان و لە هزریدا دێن و دەچن.

ئەو باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، دەزانێ بەهەشت و دۆزەخ و لێپرسینەوە و سزا و پاداشت هەیە، دەزانێ حەڵاڵ و حەرام هەیە، بەڵام ململانێ و کێشمەکێش لەگەڵ حەز و ئارەزووی دونیاییدا قورس و ئەستەمە.

کاتێك کچ باوکێکی هەبێ هەمیشە سەرقاڵی کاروکاسپی خۆی و پەیوەندی بە هاوڕێ و هاوپیشەکانیەوە بێ، تا درەنگانی شەو لە دەرەوەی ماڵ بەسەر بەرێ، دایکیشی خەریکی کاروباری خۆی بێ و

کات بۆ بەسەربردن لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەسەر بەرێت، هیچ ئەم دایک و باوکە گوێی بۆ نەگرت و گرنگی بە هەست و گازندەکانی نەدەن، بێگومان ئەوەی بە دوایدا دەگەڕێ لە دەرەوەی خێزانەکەی بەدەستی دێنێ لە هاوڕێیەتی خراپدا، یاخود گەنجێکی ڕەوشت نزم بە قسەی باق و بریق و بەڵێنی درۆ لە خشتەی دەبات.

بەداخەوە گۆڤار و ڕۆژنامە زۆر و زەبەندەکان، کلیپ و زنجیرە تەلەفیزیۆنییەکان، هەموو ئەو دەنگە نەشاز و درۆیانەن کە بانگی دەکەن بۆ یاخی بوون لە خێزان و بەرەڵڵابوون، ئیتر ئەو کاتە کە لە خێزان و ئیمان دایانماڵێ، چییان بوێت پێی دەکەن. (جۆرج هورقت) لە کتێبی شۆڕشی جنسیدا دەڵێ:

(ئەوانەی لە خەمی ئایندەی جیهان و ڕەوشت بەرزیدان، هەست دەکەن ڕۆژانە چەندەها بۆمبی سێکسی دەتەقنەوە و ماڵوێرانی و داڕمانی ئەخلاق و کۆمەڵگەی لێدەکەوێتەوە. داهاتووی نەوەکانمان چێنراوە بە خراپە و تەڵە و پیلانگێڕی، کە لەوانەیە ئەم منداڵانەی ئەمڕۆ بکەنە دڕندەیەکی بێهەست، کاتێك لە هەموو لایەکەوە دەورە دراون بە هۆکاری وورووژێنەر و فریودەر، بەجۆرێك مرۆڤایەتی لە هەر کوێ بێت تێکی دەدات، ئەستەمە ئەمڕۆ بە هەر شارێکدا نەڕۆیت و تووشی (بۆمبی جنسی) نەبیت، ڕیکلامەکان، گۆڤار بە بەرگ وێنەی ڕەنگاوڕەنگی وروژێنەر فیلم و کلیپی بەدڕەوشتی، کەناڵە نابەرپرسەکان هەموو کاردەکەن بۆ لەناوبردنی بەهاو و ڕەوشت).



شەرم و ئابڕووچونە کە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان هیچ سانسۆر و چاودێرێك لەسەر ئەو کەناڵانە دانانێن، کە هەمووی کەناڵ و پێگەی بەدڕەوشتین و بۆ هەر کەسێ لە منالّ، گەنج و پیر لە بەردەستی دایە و دەتوانێ بە ئاسانی بەکاریان بهێنێت.

بەداخەوە موسڵمانان لە زۆربەی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان دەرگایان خستۆتە سەر پشت بۆ هاتنە ناوەوەی هەموو کەرەستەیەکی فریودەر لە گشت لایەکەوە خەڵکیان پێ لە خشتەدەبەن، ڕیکلامی کاڵاکان لە کەناڵەکانیانەوە ئافرەتی ڕووت دەیکات، گۆرانی و ڤیدیۆ کلیپی ئابڕووبەر شاشەکانی پڕ کردوون، کاتێك کلتوری ڕۆژئاوا زالّ بوو بەسەرماندا خەمی ئافرەت تەنها چاولێکەرییە لە جلوبەرگ، چۆن لەش ڕێك بێ و دیمەنی جوان بێ، شوێن فاشیۆن و تازەترین مۆدێلی قژ و ماکیاج بکەوێ، بەرنامەکانی کەناڵەکان تەنها بۆ فاشیۆن و سەما و گۆرانی و ڕیبا و بەدڕەوشتییە، ئیتر تێگەیشتن و لەدین و ئەخلاق و باسی زانستی بەسود هەر بابەت نییە باس بکرێ، چونکە نە بە پەیامی خۆی دادەنێ، نە بەوەی هەقیەتی لێی بگات و باسی بکات، ئەوە چ سوك تەماشاکردن و بەهەردەردانی بەهای ئافرەتە، کاتێك دەکرێت بە کاڵایەك لە ڕیکلام و ڕاگەیاندنەکان بۆ ڕەواجدان بە کەلوپەل و کاڵاکانیان؟!

چ مانایەکە وێنەی بدرێ لە بەرگی سابوونێك، یاخود پاکەتی دەستەسڕێك؟! چ ڕێزێکە سەر بەرگی گۆڤارەکان بە وێنەی ڕووت و

ئاڵ و واڵای ئەو برازێنرێتەوە، ئایا ئەمە ناکرێتە هۆکارێك بۆ وروژاندن و فریودان لە پێناو ڕەواج بە گۆڤار و کاڵاکانیان؟!

هەر ئەمەیە وا دەکات یەکێ لە ئەکتەرە فەڕەنسییەکان کاتێك داوای گرتەیەکی ڤیزەونی لێ دەکەن لە بەردەم کامێرادا، دەقیژێنێ بە ڕووی دەرهێنەرەکەدا و دەڵێ: ئەی سەگەکان! ئێوەی پیاو جگە لە جەستەمان هیچتان لە ئێمە ناوێ تاوەکوو بەسەر جەستەی ئێمەی ئافرەتەوە ببنە ملیۆنەر، دواتر بەکولێ دەگری.

سروشت و فیترەتی پاکی ئەم ئافرەتە سەرەڕای نقومبوونی لەو کەشە بۆگەنەدا بۆ ساتێك بێدار دەبێتەوە، ئەو سروشتە پاکە تەنها بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەیەکی سەلمێنەر لەسەر قوڵایی ئەو مەینەتی و ناسۆرەی ئەو ئافرەتانەی تێدایە، کە بە ڕواڵەت بە ئازاد و پێشکەوتوویان دادەنێن.



## ٢- سارە، لە بۆیفرێند و پێشبڕکێی شاجوانییەوە بۆ لێخۆشبوونی خوای گەورە:

ئەمە چیرۆکی ئەو کچەیە نزیکبووەیە لە خوا و خوای پەروەردگار زیاتر لێی نزیکبوویەوە، هەوڵی دا بۆ ڕەزامەندی خوا و بەدەستی هێنا، ئەو لە ژیانێکی نامۆیی و نائارامیدا بوو، نامۆبوون بەدین، خوای گەورە یەکێکی بۆ تەرخانکرد تاوەکوو بانگی بکات بۆ گەڕانەوە بۆلای پەروەردگار و ڕێگای ڕاست، ئەمە چیرۆکی سارەیە کە کاتێك گوێی لە بەرنامەی یەکێك لە بانگخوازەکان دەبێت و نامەیەکی بۆ دەنووسێت، دەڵێ:

(من کچێکم ناوم سارەیە، دایکم و باوکم لوبنانین باوکم موسڵمانە و دایکم مەسیحی، هاتوون بۆ وڵاتی ڤەنزوێلا و پاش ماوەیەك لەیەك جیابوونەتەوە، هەریەکەیان بەرەو ژیانی خۆیان چوون و منیش ئاوارە و دەربەدەر ماومەتەوە، خوای گەورە جوانییەکی زۆری پێ بەخشیوم، ئەمە بووە هۆی ئەوەی قاچەکانم بەرەو پێشبڕکێی شاجوانی هەڵخلیسکان و لەکۆتاییدا لە کارکردن لە باڕەکاندا خۆم بینییەوە.. هاوڕێی کوڕم هەبوو لە بیرم کرد کە من موسڵمانم، هەرچەندە من لە بارەی ئیسلامەوە هیچم نەدەزانی، تەنها ناوەکەی نەبێ، لە قورئانیش تەنها وێنەکەی.

ڕۆژێك لە پڕ چاوم کەوتە سەر کەناڵی (إقرأ) و بانگخوازێکم بینی باسی لە پاکداوێنی دەکرد، بۆ یەکەمجار هەستم بە شەرمەزاری کرد لەخۆم، کە چۆن بوومەتە کاڵایەکی سوك و بێنرخ لە دەستی پیاوخراپ

و سەرسەرییەکاندا، ئێستا هیچ موسڵمانێك ناناسم تۆ نەبێ، کە ئەم نامەیەت بۆ دەنێرم و دڵی خۆمت بۆ دەکەمەوە، پرسیارەکەم ئەوەیە ئایا بەسەر ئەم هەموو داوێنپیسی و گوناهەی کە کردوومە، خوای گەورە لێم خۆش دەبێت و تۆبەم قبوڵ دەکات؟

ئەو بانگخوازە دەڵێ: وەڵامی نامەکەم دایەوە و باسی سۆز و میهرەبانی پەروەردگارم بۆ کرد بۆ بەندە تاوانبارەکانی و فەزڵ و گەورەیی خوای گەورە بەرامبەر تۆبەکاران، دواتر نامەی نارد کە دەمەوێ نوێژ بکەم، بەڵام سورەتی (فاتیحە) نازانم، دەمەوێ قورئان لەبەربکەم، منیش بە پۆستێکی خێرادا خەتمێکی دەنگی قورئانم بۆ نارد (ئەو کاتە ساڵی (٢٠٠٥) ئینتەرنێت بەم فراوانییە لەبەر دەستدا نەبووە)، پاش سێ ڕۆژ وتی: ئەوە سورەتی (الرحمن و النبأ)م لەبەرکرد، دەستم کردووە بە نوێژکردن، هاوڕێ کوڕەکەم واز لێهێناوە و دەرم کردووە. ئێستا لە بارِ ئیش ناکەم و لە کارەکەم دوورکەوتوومەتەوە.

ئەم کچە دەستی کرد بە گەڕانەوە بۆلای خوا و کاتێك خودای خۆی ناسی، خۆی دۆزییەوە، دوای دوو هەفتە ئیتر دەنگی نەما و نامەی نەدەنارد.

جارێك وتی سەرم زۆر دێشێ نەمتوانیوە نامە بنێرم، دوای پشکنین و چوونە پزیشك وتی: دەرکەوتووە کە تووشی شێرپەنجەی مێشك بووم، ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو لەلام وتی من هیچ نیگەران نیم، بەڵکوو خۆشحاڵم، چونکە پێش ئەم نەخۆشییە خوام ناسی و



خۆشەویستی پەروەردگارم چووە دڵمەوە و بەرەو ڕووی چووم، دوو ڕۆژیتر نەشتەرگەریم بۆ دەکرێ، تەنها ترسم لەوە هەیە ئەگەر مردم خوای گەورە لێم خۆش نەبێت!

پێموت: چۆن خوای گەورە لە تۆبەکاران خۆش نابێت؟ بەڵکوو بە گەڕانەوەت بۆلای خوای پەروەردگار ڕێزت لێنراوە و بەلەبەرکردنی سورەتی (الرحمن) تۆ لەبەردەم خوای (أرحم الراحمین)دایت، دەرگای هیوا و گەشبینیم لێکردەوە و ئەو نائومێدییەی هەیبوو ڕەواندمەوە. ئەمجا وتی: هەموو کاسێتەکانم بردووە بۆ مزگەوت تاوەکوو دوای خۆم ببێتە چاکەی نەبڕاوە بۆم، دوای چەند ڕۆژێك هاوڕێ مەسیحییەکەی نامەیەکی بۆ ناردم و وتی: سارە مرد.

## ٣- ئەی خوشکەکەم پرسیار لە خۆت بکە:

ئایا سوپاسی پەروەردگارت کردووە لەسەر نیعمەتی ئیسلام؟!

- ئایا پێنج فەرزە نوێژەکانت لەکاتی خۆیدا ئەمجام دەدەیت؟!

- ئایا قورئان بە تێگەیشتن و خشوعەوە دەخوێنی؟!

ڕۆژانە کاتت تەرخانکردووە بۆ خوێندنی بڕێك لە قورئانی پیرۆز؟

- ئایا بەرامبەر دایك و باوکت چاکەکاری؟

- ئایا خوای گەورە بە چاودێری خۆت دەزانی بەسەر جوڵە و کارەکانتەوە لە پەنامەکی و ئاشکرادا؟

- ئایا سنوری شەرع دەپارێزی بە پۆشینی پۆشاکە شەرعییەکەت (حیجاب) کە فەرمانی خوایە؟

- ئایا هاوڕێیەتی کەسانی چاك و لەخواترس دەکەیت و دوورئەکەویتەوە لە هاوڕێی خراپ؟

- ئایا هەمیشە نزا دەکەیت خوای گەورە لەسەر ئەم دینە ڕاوەستاو و پایەدارت بکات؟

- ئایا هیچ توێشوویەکت ئامادەکردووە بۆ ئەو سەفەرە تەنها کە چاوەڕێتە؟

- ئایا بیر دەکەیتەوە لەو ساتەی فریشتەی گیان کێشان دێتە لات و تۆش غافڵ و بێ ئاگای؟

- ئایا بیرت لە یەکەم شەوی قەبر کردۆتەوە؟

- ئایا بیرت لە قیامەت کردۆتەوە، ئەو ڕۆژەی هەموو بەندەکان لە بەردەم لێپرسینەوەی پەروەردگاری جیهانیاندا دەوەستن؟

- ئایا ئامادەی لەبەردەم خوای گەورەدا ڕاوەستیت، خوای تۆڵەسێن، خوای زەوی و ئاسمانەکان، تاوەکوو لە کردەوەکانت بپرسێتەوە؟

## ٤- بەخۆشی بژی:

ئیسلام ڕێگا لە ژیان کردنت ناگرێ، هیچ کاتیش ئەوەی ناوێ تەنها لە عیبادەتکردندا بیت، بەڵکوو هەمیشە لە پێشینەبیت لە دەستخستنی زانست و زانیاری، خۆت ڕۆشنبیرکەیت بە هەموو زانیارییەکان، کاربکەیت و دەوڵەمەندبیت تا توانات هەبێ بۆ خێر و چاکەکردن.

پەروەردگار دەیەوێت مافی جەستەت بزانی لە خۆراك و وەرزش و تەندروستی، خۆت دڵخۆش کە بە دەستخستنی هەموو حەڵاڵەکان دوورکەوەرەوە لە حەرامەکان، مافی خێزان و کەسوکارت بزانە و بەجێی بێنە، باشبە لەگەڵ دایك و باوکت و بەخێویان بکە، مافی هاوسەرەکەت بزانە و گوێڕایەڵی بکە جگە لە سەرپێچی خوای گەورە نەبێ.

مافی منالەکانت بزانە بە پەروەردەی چاك و ئاراستەکردنیان بۆ ڕێگای ڕاست و دروست، مافی کۆمەڵگەکەت بەجێ بهێنە بەکارکردن بەوەی هەرچی باشە بۆ ئیسلام و موسڵمانان. لەسەروو هەموو ئەمانەوە مافی خوای پەروەردگار بەسەر خۆتەوە بزانە بەیەکتاپەرستی و عیبادەت و گوێڕایەڵی لە فەرمانەکانی.

لە کۆتاییدا ئەم ئامۆژگارییانە بۆ کچانی داوێن پاك و ژنانی بەڕێزە، ئەم پەیامە بۆ ئەو ئافرەتە موسڵمانە پاکەیە کاتێك فەساد و بەدکاری لە دەوروبەری زۆر دەبێ سەری بۆ ئاسمان بەرزدەکاتەوە و دەڵێ: (یا مقلب القلوب والأبصار ثبت قلبي على دينك).

بیرۆکەی نووسینی ئەم کتێبەم لەوەوە هات کاتێك هاوڕێیەکم پێی وتم: هەموو کتێبەکانت بۆ خەڵکە بە گشتی، یا بۆ دایك و باوك، بۆچی شتێك نانووسیت تایبەت بە کوڕان و کچان، کە لەم سەردەمەدا زۆر پێویستییان پێیەتی و لەو ڕێگایەوە عەقڵ و دڵیان بدوێنی.

بەڵێ، لە ڕێگای ئەم کتێبەوە دەمەوێ وەڵامی زۆرێك لەو پرسیارانە بدەمەوە کە مێشکی کچانی سەرقاڵ کردووە، تاوەکوو باوەڕیان بەهێز

بکات و دڵیان بەدینەکەیانەوە پەیوەست بکات، تاوەکوو زیاتر قەناعەتیان بەدین و بیروباوەڕکەیان هەبێت، هەتا ئاگاداریان بکەم لەو مەترسییانەی لە هەموو لایەکەوە دەوری داون، لە گەنجی بەدڕەوشت و نالەبار لە ڕاگەیاندن و میدیای ڕوخێنەر و تێکدەر، لە تەڵە و پیلانی ناحەزە ساختەچییەکان لە هەموو لایەکەوە.

خوایەگیان تۆ شاهیدیت هیچ مەبەستێکم نەبووە لە نووسینی ئەم کتێبە ئەوە نەبێ ببێتە چرایەکی ڕووناك و ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای کچانی موسڵمان، ڕێنموونییان بکات بۆ سەر ڕێگای ڕاست، ئەوانەی دوورکەوتوونەتەوە لەو شا ڕێگایە، بگەڕێنەوە بۆی بۆ کەناری ئارامی و ئاسودەیی، خوایەگیان داواکارم سودی بۆ خوێنەرەکانی هەبێت و پاداشتیش بۆ نووسەرەکەی و بڵاوکراوەکەی، بیکەیتە توێشوویەك کە تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆیە، ئەو توێشووەی لە ڕۆژێك فریادڕەسم بێت کە نە ماڵ و نە منالّ و نە کەسوکار فریام ناکەوێ، تەنها خاوەنی دڵە پاك و بێگەردەکان نەبێ بە زیکری تۆ، خوایە داوای باوەڕێکت لێدەکەم ڕێنموونیم بکات، بەختەوەرم بکات بە بینینی ڕووی تۆ، ئایا جگە لەم نزایە هیچ شتێکیتر هەیە؟!

الدکتور حسان شمسی پاشا

حمص ٢٠ ئابی ٢٠٠٥

بەرامبەر ١٦ـی ڕەجەبی ١٤٢٦

# وەرزی یەکەم

# ئافرەتە نەمرەکان

## نموونەی ئەمانە بکەنە پێشەنگ و سەرمەشق:

ئافرەتی موسڵمان لە هەموو زەمەن و شوێنێکدا، پێویستی بە پێشەنگێکی چاکە تا بە ڕێچکەیدا بڕوات و ڕێگای ئەو بگرێت، پێویستی بە پێشەنگی پاك و چاکە، کە خاوەنی دڵێك بێت خوا بە گەورەیی و پاك و بێگەردی بناسێت. ئەمانەی باسی یان دەکەین نموونەی چەند کەڵە ئافرەتێکن:

### ١- خاتوو فاطمە (سەلامی خوای لەسەربێت):

لەبەردەم ئەم پێشەنگە بەرزە هەڵوەستە دەکەین، لەبەردەم سەرگەورەی ئافرەتانی بەهەشت ئەویش فاتیمەی کچی پێغەمبەرە (صلی الله علیە وسلم)، ئەم خاتوونە لەگەڵ (علی کوڕی أبو تاڵیب) هاوسەرگیری کرد، نە خاوەنی خشڵ و ئاڵتون بوو، نە جلوبەرگی گرانبەها، نە چوویشە ناو کاخ و کۆشك و ماڵی ڕازاوە، بەڵکوو ماڵەکەی خانوویەك بوو لە قوڕ، یاتاق و پێخەفەکەی پشتییەك بوو لە پووش و ڕیشاڵی دارخورما، گۆزەیەك و دەستاڕێك کە گەنم و جۆی پێ دەهاڕی.. ئا ئەمە سەردار و گەورەی ئافرەتانی دونیا و ئاخیرەتە!

فاتیمەی کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کچی سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر پێخەفی پووش و پەڵاشی دارخورما دەخەوت، بە دەستی خۆی جۆی دەهاڕی هیچیش لە ڕێز و پێگەی کەم نەبووەوە، حەزرەتی عەلی (سەلامی خوای لێ بێ) دوای وەفاتی باسی دەکات و دەفەرمووێ:

(ئەو کچی پێغەمبەری خوا بوو، بەڵام خۆی هەموو کاروبارەکانی دەکرد، نە خزمەتکار و نە کەنیزەك، بە دەستاڕ دانەوێڵەی دەهاڕی، جێگەی دەستاڕەکە بە دەستییەوە دیار بوو، خۆی گۆزەی دەکردە شانی و ئاوی دەهێنا، هەمیشە جێی گوریسەکە بەسەر شان و ملییەوە دیار بوو، ماڵی گسك دەدا و سەروچاو و جلوبەرگی دەبوو بە تەپ و تۆز، خۆی ئاگری دەکردەوە و دوکەڵ دەچوو بە سەروچاویدا، ئایا بەم کارانەی کەمی کرد؟!

پاك و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگار کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، گەنم بهاڕێ و جێی دەستاڕەکە بە دەستییەوە دیاربێ؟!

ئایا بیستتان؟ ئەی ئەوانەی لوت بەرزن و وا دەزانن گەر کاروباری ماڵ و مێرد و منداڵ بەرن بەڕێوە، کەم دەکەن و ڕێز و گەورەییتان نامێنێ؟

سەیرکەن ئەو ڕۆژەی بەهۆی ماندوویی خاتو فاتیمەوە حەزرەتی عەلی (سەلامی خوا لە هەردووکیان) پێی دەڵێ: بچۆ خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، سکاڵای حاڵی خۆت بکە تاوەکوو خزمەتکارێکت بداتێ، دەچێتە خزمەتی، بەڵام شەرم دەکات و ڕووی نایەت بیڵێ،

دواتر دێتەوە بۆلای هاوسەرەکەی و تا پێکەوە بڕۆن و عەرزی بکەن، ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتی: هەر ئێستا فەرمانتان جێبەجێ دەکەم؟ ئایا وتی بە هاوەڵەکانی خێرا خزمەتکارێکیان بدەنێ، چونکە ئەو کچمە و (عەلی)یش ئامۆزامە؟!

نا وەاللە، بەڵکوو فەرمووی: سوێند بەخوا خزمەتکارتان نادەمێ، تەماشاکەن ئەهلی (صیفه) لە برسێتیدا سکیان پێچ دەدەن و هیچ نییە بیخۆن، بەندەکان دەفرۆشم مەسرەفی ئەوانی پێدەکەم، نەك بیدەمە ئێوە بۆ کارکردن.

ڕۆشتنەماڵەوە، دواتر شەو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتە سەردانیان، (فاتیمە و عەلی) (سەلامی خوایان لێبێت) لەسەر یەك پێخەف خەوتبوون، پارچە قوماشێکیان دابوو بە خۆیاندا، کە ئەگەر سەریان داپۆشیایە قاچەکانیان بەدەرەوەبوو، پێی فەرموون: ئایا پێتان بڵێم چی لە خزمەتکار باشترە بۆتان؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی ئەگەر چوونە جێگاکەتان ٣٣ جار (سبحان الله) ٣٣ جار (الحمد لله) ٣٤ جار (الله أكبر) بکەن ئەوە باشترە لە خزمەتکار بۆ ئێوە). (رواه البخاری).

حەزرەتی عەلی (سەلامی خوای لێبێ) دەفەرمووێ: سوێند بەخوا لەو کاتەی فێری کردین شەوێك نەبووە نەیخوێنین.

(محمد اقبال)ی شاعیر لە وەسفی خاتوو (فاتیمە)دا کاتێك خۆی هەستاوە بە کاروباری ناو ماڵ، دەڵێ:

فمها يرتلُ اي ربكما بينما يدها تديرُ على الشعير رحلها

بلت وسادتها لالئُ دمعها من طول خشيتها ومن تقواها

دەمی بە زیکری خواوە بوو

لە کاتێکدا بە دەستی خۆی جۆی دەهاڕی

پشتییەکەی تەڕ دەبوو لە فرمێسکەکانی

لە ترس و بیمی خودا و بەهێزی باوەڕی

٢- خاتوو عائیشە گەورە زانای ئافرەتان (سەلامی خوای لەسەر بێت):

ئەمە ئەو کەڵە ئافرەتەیە کە دونیای پڕ کرد لە زانست، (الزهری) لە وەسفیدا دەڵێ: گەر عیلم و زانستی هەموو ئافرەتانی جیهان کۆبکەیتەوە لەبەرامبەر زانست و عیلمی حەزرەتی عائیشەدا، زانستی خاتوو عائیشە باشتر و زیاتر و بەسوودترە.

لە (طبقات ابن سعد)دا هاتووە: خاتوو عائیشە زاناترینی خەڵك بوو کە گەورە هاوەڵان پرس و ڕای شەرعییان پێ دەکرد.

لە ئەبو سەلەمەوە: هیچ کەسێکم نەدیوە بەقەد حەزرەتی عائیشە (سەلامی خوای لێبێت) زاناتربێ لە سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بۆ ڕا وەرگرتن هیچ کەس لەو فەقیهتر نەبوو. لە هۆی دابەزینی ئایەتەکان هیچ کەس لە خاتوو عائیشە شارەزاتر نەبووە، لە سەردەمی حەزرەتی (عومەر و عوسمان)دا (سەلامی خوایان لێبێت) فەتوای داوە، واتە (مفتی) بووە تا ئەو کاتەی وەفاتی کرد.

### ٣- خاتوو (ساره) خێزانی (ئیبراهیم) (علیهما السلام):

خاتوو ساره خێزانی (ئیبراهیم خلیل)، بەزۆر لە ماڵەکەی هێنایانە دەرەوە لە میسر، لەلایەن زۆردارێکی زاڵمەوە ویستی کاری خراپەی لەگەڵ بکات، ئەو ئافرەتێکی بێهێز بوو، بەڵام بە پابەندبوون بە بەرنامەی خواوە هێزی دایە بەر خۆی، دەستنوێژی گرت و ڕووی کردە خواو وتی: خوایەگیان تۆ ئەزانی من باوەڕم بەتۆ و بە نێردراوەکەت هێناوە، داوێنی خۆم پاراستووە، سا خوایە ئەم بێباوەڕەم بەسەردا زاڵ نەکەی و لە کۆڵمی کەرەوە و بە ویستی خۆت لێم لادە.. ئەو بێباوەڕە لە شوێنی خۆیدا بەستی و نەیتوانی بجوڵێت، ئەو لەکاتی خۆیدا سنورەکانی پەروەردگاری پاراستبوو ڕەزامەندی بەدەست هێنابوو، خوای گەورەش لەکاتی ناڕەحەتی و سەختیدا بەهانایەوە هات و پاراستی.

بەڵێ، لە شوێنی خۆیدا نەیتوانی بجوڵێت و هەنگاو بنێت، هەر کە پەلوپۆی دەکرایەوە دەیویست دەست بەرێ بۆ خاتوو ساره و لێی نزیک بێتەوە، دووبارە چوار پەلی ڕەق دەبوو و لە جوڵە دەکەوت، ئەمجا زانی ناتوانێ لێی نزیک بێتەوە، هاواری کردە خزمەتکارەکانی و وتی: ئێوە چ شەیتانێکتان بۆ من هێناوە بیبەنەوە بۆ ئیبراهیم و (هاجر)ی خزمەتکاریشی لەگەڵ بنێرن، تەنها ئەوە نەبوو بە ساغ و سەلیمی گەڕایەوە، بەڵکوو بوو بە خاوەن بەندەیەکیش. ئایا خوای گەورە نافەرمووێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ﴾ الطلاق: ٢ – ٣.

واتە: (ئەوەی لەخوا بترسێت و پارێزگار بێت خوا دەرووی لێ دەکاتەوە، لە شوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکردبێت و بە خەیاڵیدا نەهاتبێت، جا ئەوەی پشت بەخوا ببەستێت ئەو زاتە بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت).

### ٤- قژداهێنەری کچەکەی فیرعەون:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە ڕیوایەتی ئیمامی ئەحمەد ـ لەبارەی شەوڕەوی هەواڵی ئەو شەوە دەفەرمووێ: کاتێك ئەو شەوە بردمیانە سەرەوە بۆنێکی زۆر خۆش هات بە سەرما، وتم: ئەی جوبرەئیل ئەم بۆنە خۆشە چییە؟ جوبرەئیل وتی: ئەوە بۆن و بەرامەی قژداهێنەری کچەکەی فیرعەون و مناڵەکانیەتی.

ئەم ئافرەتە قژی کچەکەی فیرعەونی دادەهێنا، ڕۆژێکیان کاتێك قژەکەی شانە دەکرد، شانەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە، کە ویستی هەڵیگرێتەوە وتی (بسم الله)، باوەڕی بەخوای تاك و تەنها هێنابوو، بەڵام تا ئەو ساتە لە ترسی فیرعەون شاردبوویەوە.

کچەکەی فیرعەون لێی پرسی: باوکم؟

وتی: نا، بەناوی خوای پەروەردگارم، پەروەردگاری باوکت و هەموو جیهانیان.

کچەکەی فیرعەون وتی: جا کەواتە منیش ئەڵێم بە باوکم.

وتی: دەی پێی بڵێ.

خێرا چوو هەواڵەکەی دا بە فیرعەونی باوکی، ئەویش هاتەلای و بەلوت بەرزییەوە وتی: ئایا جگە لە من خوایەك هەیە؟

وتی: بەڵێ، خوای من و تۆ و هەموو جیهانیان. فیرعەون پێی وت: ئایا پەشیمان دەبیتەوەو ئیتر وانەڵێی.

وتی: نەخێر.

فیرعەون: کەواتە سزات دەدەم، یا دەتکوژم.

وتی: ﴿فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ﴾ طه: ٧٢. واتە: (چیت لەدەست دێت ئەمجامی بدە و درێغی مەکە، بەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە هەر کۆتایی دێت).

قاچ و دەستیان داکوتی، هەموو جۆرە سزایەکیان دا، بەڵام ئەو بەشیرینی باوەڕەکەی تاڵاوی هەموو ئەو سزایانەی دەتوانەوەو دەیوت: ئەمە چەند ساتێکە و دەبڕێتەوە، بەدواییدا بەهەشتی نەبڕاوە و باخ و ڕووبارەکانی خوای گەورە و بەتوانایە.

دووپشکیان پێوە دەنا تا بگەڕێتەوە بۆ پەرستنی فیرعەون، بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر باوەڕی بە خوای تاك و تەنها و دەیوت: خوای من و تۆ و هەموو جیهانیان، ماریان بۆ دەهێنا بەڵام هیچ سودێکی نەبوو بۆ فیرعەون و ئەو سزایانە نەیترساند. دواتر فیرعەون زانی ئەم سزایانە بێ سودە، وتی: دەتسووتێنم و دەتکوژم.

فەرمانی کرد مەنجەڵێکی گەورەی مسیان هێنا و لەسەر ئاگر دایاننا، مناڵەکانی پێش خۆی تێبکەن تا لە حەسرەتی مناڵەکانی باوەڕبێنێت بە فیرعەون، یەکە یەکە بە بەرچاویەوە مناڵەکانیان تێکرد،

هیچ کاری تێنەکرد، کاتێك منالّی دووهەمیان هێنا بەدایکی وت: دایکە گیان ئارام بگرە، ئەگەر ئارامگربیت لای خوای پەروەردگار نیعمەت و خۆشی نەبڕاوەت هەیە.

بەم جۆرە بە بەرچاویەوە منالّەکانیان دەسووتاند و ئەمیش سوربوو لەسەر باوەڕی پتەوی خۆی، ئێستا تەنها خۆی و منالّە شیرە خۆرەکەی مابوو بە باوەشییەوە، نووساندبووی بە سنگیەوە، ئەمانیش دەبوو خۆیان فڕێ دەنە ئاگرەکە، بۆ ساتێك لەبەر منالّە شیرەخۆرەکەی دوو دلّ بوو خۆی فڕێ بات و قاچی هەڵنەدەهات، بەڵام لەو کاتەدا خوای گەورە منالّەکەی هێنایە زمان و بەدایکی وت: دایکە خۆت فڕێ بە، سزای دونیا ئاسانترە لە سزای ئاخیرەت، بەو شێوەیە لەگەڵ منالّەکەیدا خۆی فڕێ دا لەناو پریشکی ئاگرەکەدا برژان و ڕۆحیان سپارد، تاوەکوو بە باوەڕێکی پتەوەوە ڕووسور و سەربەرز بگات بە لیقای پەروەردگارەکەی.



## ٥- خاتوو ئاسیە خێزانی فیرعەون:

خاتوو ئاسیە هاوسەری فیرعەون بینەری ئەو هەڵوێستەبوو کە لەنێوان فیرعەون و قژداهێنەرەکەدا ڕوویدا، ئەو باوەڕی بەخوای تاك و

تەنها هێنابوو، بەڵام لە ترسی فیرعەونی هاوسەری هێشتا ئاشکرای نەکردبوو.

کاتێك ئەم دیمەنەی بینی کە بەسەر قژداهێنەرەکەدا هات، وتی: بە فیرعەون: وەیل بۆ تۆ، چۆن دەرباز دەبی لە دەستی خوا.

فیرعەون وتی: شێتێتی ئەو ژنە تۆیشی خەڵەفاندووە؟! خاتوو ئاسیە وتی: بەڵکوو باوەڕم بەخوای من خوای قژداهێنەر و خوای هەموو جیهانیان هێناوە.

فیرعەون چووە لای دایکی ئاسیە و وتی: کچەکەت واز دەهێنێت و پەشیمان دەبێتەوە، یان ئەو سزایەی خزمەتکارەکەم پێدا بە ئەویشی بچەژم؟ دایکی هاتە لای و قسەی لەگەڵ کرد تا واز بهێنێت، بەڵام بە دایکی وت: ئەی دایکە تۆ دەتەوێت من بێباوەڕبم بە پەروەردگارم، سوێند بەخوای تاك و تەنها هەرگیز ئەوە ناکەم.

کاتێك پێشنیارەکەی دایکی پەشیمانی نەکردەوە بردیان بۆ سزادان و ئەشکەنجەیان دا بە قورسترین سزا، ـ دەست و قاچیان بە بزمار داکوتی، لەبەر خۆری گەرم دایاننا، خواردن و خواردنەوەیان لێ قەدەغەکرد و بە توندی لێیان دەدا، بەڵام ئەو بە خوای زەوی و ئاسمانەکان پەنای دەگرت و وتی: ﴿ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ التحريم: ١١. واتە: ( پەروەردگارا لای خۆت لە بەهەشتداماڵێکم بۆ دروست بکە و لەدەست فیرعەون و کاروکردەوەکانی ڕزگارم بکە و لەدەست قەومی ستەمکاران دەربازم بکە).

ئەگێڕنەوە کاتێك ئەم نزایەی وت و سەری بەرزکردەوە، ڕووپۆشی دونیای سەرچاوەکانی لادرا، هەتا ماڵەکەی خۆی لە بەهەشتدا بینی، واتە لەنێوانی ئەم و بەهەشتدا هیچ بەربەستێك نەما، تا وای لێهات بە بینینی ماڵەکەی لە بەهەشتدا پێکەنی، دەوروبەرەکەی وتیان بێگومان ئەمە شێتە، ئەو ئەشکەنجە دەدرێت کەچی پێدەکەنێ! نەیاندەزانی خوای گەورە دڵی خۆشکردووە و مەنزڵی خۆی لەبەهەشتی هەتا هەتاییدا پیشان داوە.

ئەمجا فیرعەون فەرمانی کرد بەردێکی گەورە بێنن و بیدەن بەسەریدا و بەو جۆرە بیکوژن، بەڵام پەروەردگار پێش ئەوەی تاشە بەردەکە بگاتە سەری گیانی کێشا، بەو باوەڕە پتەوەوە چوویەوە لای خوای تاك و تەنها و بووە نموونەی بەرز بۆ باوەڕداران.

لەبەرامبەر ئەم ئافرەتە خواپەرست و باوەڕ پتەوەدا، لە قورئانی پیرۆزدا باس لە ژنەکەی (ئەبو لەهەب) دەکرێت، ئەبو لەهەب کە مامی پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم)، خۆی و ژنەکەی بە هەموو شێوەیەك دژایەتی پێغەمبەریان دەکرد. ژنەکەی هەرگیز ناوی پێغەمبەری نەدەهێنا لە بری (محمد) دەیوت (مذمم)، هەمیشە لە کۆڕ و دانیشتنەکانیدا لەناو قورەیشیەکاندا گاڵتەی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکرد و بە هەجووەوە باسی دەکرد. تا لە ئاست ئەم بێ شەرمی و زمان درێژییەیدا، سورەتی (المسد) هاتە خوارەوە و ئایەتی ﴿وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ۝٤ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ ۝٥﴾ واتە: (هەروەها ژنەکەشی کە هەمیشە کۆڵە دارێکی بە کۆڵەوەیە و

گوریسێکی چنراو لە پووشی خورما بە گەردنیەوەیە، لە قیامەتیشدا زنجیری ئاسن دەکرێتە ملی).

ئەم ژنە لە گەورەکانی قورەیش بوو، کاری نەدەکرد و دار بێنێ، بەڵکوو قورئانی پیرۆز وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو هەوڵ و ماندووبوونەی دەیدا بۆ ناشرین کردنی ئیسلام و ئازاردانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەیچوێنێ بەو کەسەی بەکۆڵ دار دێنێت بۆ سووتاندن. دەوترێت ئەو ژنەی پووش و پەلاشی درکاوی لەسەر رێگای پێغەمبەر دادەنا تاوەکوو ئازاری بدات، ئەوەبووە بۆیە خوای گەورە وەها ناوی بردووە.. والله أعلم.

## ٦- خاتوو (سەفیە) بکوژی یەهودییەکە:

ئەم کەڵە ژنە خاتوو سەفیەی پوری پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، خوشکی شێری ئیسلام (حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب)، خێزانی (عەوام)ە کە سوارچاکێکی وەکوو (زوبێر کوڕی عەوام)ی پەروەردەکرد و پێگەیاند.

لە کاتی جەنگی (أُحد)دا کاتێك بینی چی بەسەر موسڵماناندا هاتووە ـ کە ئەم ناوی دەبرد بۆیان لەکاتی شەڕەکەدا ـ وەکوو شێرە ژنێك هات و تیروکەوانی لە یەکێ لە ڕاکردووەکان سەند و وتی: داوەشێن ئەوە پشت لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەن و دەبەزێن.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کاتێك ئەمەی بینی، ئاماژەی بە زوبەیر کرد و فەرمووی: ئەوە دایکتە، زوبەیر وتی: چییە چی بووە؟

خاتوو سەفیە وتی: سوێند بە الله هەواڵیان داومەتێ کە حەمزەی برام سوکایەتی بە تەرمەکەی کراوە و جەستەی شێوێنراوە، لەبەر خوا ئارام دەگرم.

کاتێك شەڕ کۆتایی هات، چووە سەر تەرمی حەمزە (سەلامی خوای لێبێت)، بینی سکی هەڵدڕاوەو جگەری دەرهاتووە، گوێی بڕاوە دەموچاوی تێکدراوە، وتی: ڕازیم بە قەزا و قەدەری پەروەردگار. نە دەموچاوی خۆی ڕنی و نە یەخەی دادڕی نە ناشکوری کرد، چونکە دەیزانی ئەمە قەزا و قەدەری خوایە بۆ براکەی.

جارێکیتر و لە دیمەنێکی تردا ئەو خاتوو سەفیەیە لە ڕۆژی (خەندەق)دا، پێغەمبەر هەموو ئافرەتەکانی نارده قەڵای (حسان)، کە قەڵایەکی تۆکمە و پارێزراوبوو، هەموو پیاوەکان چوونە جەنگ و هیچ پاسەوان و پیاویان لانەبوو. یەهودییەکان بینییان بێ پاسەوانە، یەکێکیان چووە سەرەوە بزانێ کەسی لێیە یان نا؟ کاتێك ئافرەتەکانی بینی قسەی ناشرینی پێ وتن، خاتوو سەفیە کە ئەمەی بینی خێرا لەناو قەڵاکە عەمودێکی هێناو لێیدا و کوشتی، پاشان سەری بڕی و سەرەکەی هەڵواسی بە بەرزاییەکەدا، کە یەهودییەکان ئەمەیان بینی ترسان، ئیتر نەیانوێرا بڕۆنە سەرەوە، وتیان وامانزانیوە (محمد) تەنها ژنی لەوێ داناوە، (وایانزانی ئەم کارە پیاو کردوویەتی).

بەم شێوەیە خاتوو سەفیە بووە یەکەم ئافرەت لە ئیسلامدا کە بێباوەڕی کوشتبێ و ئافرەتەکانیشی لەدەست درێژی یەهودییەکان پاراست.

### ٧- ئەو ئافرەتەی موسڵمانانی لە سزای خوا ڕزگارکرد:

لە سوڵحی (حودەیبییە) کافرەکان زۆر لوت بەرزبووبون و غروری جاهیلی گرتبوونی، نەیانهێشت وشەی (رسول الله) بنووسرێت لە پەیماننامەکەدا، تەنها بە (محمد) ڕازی بوون و چەند مەرجێکی تریش، کە بۆ موسڵمانان قورس بوو قبوڵکردنی، موسڵمانان لە دوورەوە هاتبوون بۆ زیارەتی کەعبە، بەڵام ئەوان ڕێیان پێ نەدەدان بەپێی مەرجی پەیماننامەکە. ئەوەش موسڵمانانی زۆر تووڕەکرد. حەزرەتی عومەر (سەلامی خوای لێبێت) زۆر تووڕەبوو، چووە لای ئەبوبەکر (سەلامی خوای لێبێت) وتی: ئەی ئەبوبەکر ئایا ئەوە پێغەمبەر نییە (صلى الله عليه وسلم)؟

وتی: بە دڵنیاییەوە بەڵێ.

وتی: ئێمە موسڵمان نین؟، وتی: بەڵێ، وتی: ئەی ئەوان بێباوەڕنین؟ هەر وەڵامی دایەوە، وتی: بەڵێ بەدڵنیاییەوە بێباوەڕن.

حەزرەتی عومەر بە تووڕەییەوە وتی: ئەی باشە بۆچی ئەم سەرکزییە قبوڵ کەین بۆ دینەکەمان؟

ئەبوبەکر وتی: ئەی عومەر ئارام بگرە و ڕاوەستاوبە لەسەر ڕێبازەکەت، سوێند بەخوا شایەتی دەدەم کە ئەوە نێردراوی خوایە،

(واتە: هیچ کارێك بێ فەرمانی خوا ناکات، ئەمەش فەرمانی خوایە و گوێڕایەڵی بن)، عومەر وتی: منیش شایەتی دەدەم کە ئەوە نێردراوی خوایە.

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە نووسینی پەیماننامەکە بوویەوە، بە هاوەڵانی فەرموو: ( هەستن قوربانی بکەن و سەرتان بتاشن و ڕیشتان کورت بکەنەوە). سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە، کەس هەڵنەسایەوە موسڵمانان لەو کاتەدا حەپەسابوون، وزەیان لێ بڕابوو لەو خەم و خەفەتەی تێیکەوتبوون.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چووە ژوورەوە، لەو کاتەدا (ئوم سەلەمە)ی خێزانی لەگەڵیدا بوو، بۆی گێڕایەوە کە هاوەڵانی چۆن خەم گرتوونی، بەو شێوەیە دەستەوئەژنۆ دانیشتوون.

ئەمجا فەرمووی: (بەهیلاکا چوون موسڵمانان).

فەرمانیان ڕەتکردۆتەوە، نە قوربانی دەکەن نە سەریان دەتاشن. ئوم سەلەمەش (سەلامی خوای لێبێت) کە ئافرەتێکی زۆر ژیر و بەدەست و بردبوو، عەرزی پێغەمبەری کرد (صلی الله علیه وسلم): ئەی پێغەمبەری خوا بڕۆ دەرەوە و قسە لەگەڵ کەسدا مەکە، قوربانیی خۆت سەربڕە و سەرتاشەکەت بانگ بکە سەرت بتاشە.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چووە دەرەوە، ئەوەی کرد کە ئوم سەلەمە عەرزی کرد، هاوەڵان کاتێك ئەم دیمەنەیان بینی لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، هەموو بە جارێك هەستان و

قوربانییەکانیان سەربڕی، سەریان تاشی، هەندێکیشیان کورتیان کردەوە.

ئایا بینیتان چۆن ئافرەتێك توانی بە یارمەتی خوا موسڵمانان ڕزگاربکات؟ ئەو کاتەی دەستەوسان بوون لە گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر و سزای خوا نزیك بوو لەسەریان.

## ٨- ئەو ئافرەتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە شوویدا:

لە (ئەنەسەوە) (سەلامی خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە، یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناوی (جولەیبیب) دوومەڵێکی گەورە بەسەر دەموچاوییەوەبوو، ژنی نەهێنابوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی وت: کە ژن بێنێت، جولەیبیب عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا نابینی ڕوو بازاڕی نیم و کێ پێم ڕازی دەبێت؟! پێغەمبەر فەرمووی: ئەی دوای ئەمە تۆ لای خوا بێ عەیب و ڕێزداریت.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ هەلێك دەگەڕا ئافرەتێکی دەست کەوێت بۆ (جولەیبیب)، تا ڕۆژێك پیاوێك لە ئەنسارییەکان هاتە خزمەتی و وتی: کچێکم هەیە بێوەژنە، حەزدەکەم پێشکەشت بکەم، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: من بۆ خۆمم ناوێ بۆ (جولەیبیب)م ئەوێ.

باوکەکە وتی: با پرس و ڕا بەماڵەوە بکەم. ڕۆشتەوە بە خێزانەکەی وت کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کچەکەمانی بۆ (جولەیبیب) دەوێت.

دایکی وتی: سوێندبێ نایدەمە جولەیبیب، ئێمە نەمانداوەتە فلان و فلان، ئێستا چۆن بیدەینە ئەو. باوکەکە بەمە غەمگین بوو، هەستا وەڵامەکە بباتەوە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

کچەکە باوکی بانگ کردەوە و هاواری کرد، کێ داخوازی منی کردووە بۆ ئەو پیاوە. وتیان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

وتی: ئایا دەتانەوێت فەرمان و داواکاری پێغەمبەری خوا ڕەتکەنەوە، من بدەنە دەست پێغەمبەری خوا، بێگومان ئەو هەرگیز من بە خەسار نادات. باوکی چووە خزمەت پێغەمبەر و (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەریش کچەکەی مارەکرد لە (جولەیبیب).

نزای بۆ کردن: (اللهمَّ صُبَّ علیهما الخیرَ صبًا، ولا تجعل عیشهما كدًا كدًا). پەروەردگارا فەڕ و بەرەکەت بڕژە بەسەریاندا و هەرگیز ژیانیان هەژار و بێ ڕۆزی نەکەی).

چەند ڕۆژێك دوای هاوسەرگیرییان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چوو بۆ غەزا، (جولەیبیب)یش لە خزمەتی چوو بۆ غەزاکە، کە جەنگ تەواوبوو، هەموو بەدوای یەکدا دەگەڕان، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە هاوەڵانی پرسی: (ئایا کەستان لێ ون بووە؟).

وتیان: فلان و فلان، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (من جولەیبیبم ون کردووە). گەڕان بەدوایدا لە شوێنێک تەرمەکەی لەپاڵ تەرمی حەوت لە کافرەکاندا کەوتبوو..

پێغەمبەر فەرمووی: (حەوتی کوشتووە ئەمجا کوژراوە، ئەو لە منە و منیش لە ئەوم). ئەمجا بە دەستی موبارەکی تەرمەکەی هەڵگرت و قەبری بۆ هەڵکەند و ناشتی.

ئەنەس دەڵێ: سوێند بە الله، هیچ کەس لە ئەنسارەکان بەقەدەر ئەو ژنەی جولەیبیب دەوڵەمەند نەبوو، ڕزق و ڕۆزی دائەباری بەسەریا، پیاوەکان پێشبڕکێ یان بوو بیخوازن، (ئاماژەیە بۆ نزاکەی پێغەمبەر کە بۆی کردن).



## ٩- ئەو ئافرەتەی پرچەکانی بەخشی لەپێناوی خوا:

(ئەبو قودامە) لەسەر میمبەر لە دیمەشق وەستاوەو وتار دەدات، باس لە گەورەیی جیهاد و بەختکردنی ماڵ و گیان لە پێناو بەرنامەکەی خوا، خەڵکەکە ئەوەندە بە دڵ گەرمییەوە گوێبیستی ئامۆژگارییەکان بوون، کە هێشتا لە مزگەوت نەهاتبووە دەرەوە، پێشبڕکێیان بوو لەسەر چوون بۆ شەڕ.

کاتێك هاتە دەرەوە ئافرەتێك لەسەر ڕێگاکەی سەلامی لێکرد، وەڵامی نەدایەوە (لە ترسی گێچەڵ و فیتنە)، جاری دووەم بە هەمان شێوە وەڵامی نەدایەوە، بۆ جاری سێهەم کاتێك ئافرەتەکە سڵاوی کرد و ئەبو قودامە وەڵامی نەدایەوە، وتی: ئەی ئەبوقودامە ئەمە پیشەی پیاوچاکان نییە !

ئەڵێ کە وای وت، منیش وەستام، هاتە پێشەوە و وتی: گوێم لێ بوو خەڵکیت هان دەدا بۆ جیهاد لە پێناوی خوا و بەخشینی ماڵ و گیان، منیش گەڕام هیچم شك نەبرد بەنرختر بێت لەلام لەم پرچانەم زیاتر بیدەم لە ڕێگای خوادا، ئەوەتا بڕیومە و بیبە بیکە بە لغاوی سوارییەکان بۆ جیهاد کردن، بەو هیوایەی خوای گەورە لەجەنگاوەرانی جیهاد هەژمارم بکات.

❊❊❊

### ١٠- ئافرەتێك دەبێتە مامۆستای هاوسەرەکەی:

ئەمە کچی سەعیدی کوڕی موسەییبە (رحمه الله)، هاوسەرگیری لەگەڵ قوتابییەکی باوکیدا کردبوو، کاتێك ڕۆژبوویەوە هاوسەرەکەی جلی پۆشی بچێتە دەرەوە، پێی وت: بۆ کوێ؟

موسەییب بۆ وانە خوێندن. وتی: دانیشە هەموو ئەو وانانەی باوکم پێت دەڵێ من خوێندوومە و پێت دەڵێمەوە، بەم شێوەیە هاوسەرەکەی فێری هەموو زانستەکان کرد، ئافرەتی وەها موسڵمان دەبێت ببێتە مامۆستایەکی چاك لە ماڵەکەیدا بۆ هاوسەر و مناڵەکانی و بەو زانستەی هەیە ببێتە چرای ڕووناکی ماڵ و خێزانەکەی.

### ١١- دایکی ئیمامی ئەحمەد

ئەم شێرە ژنە، یەکێکیترە لەو ئافرەتانەی کە پێویستە بکرێتە نموونەی ژیان و چاوی لێبکرێت. پێشەوا (ئیمامی ئەحمەد) کە هەر بە مناڵی باوکی دەمرێت و دایکی پەروەردەی دەگرێتە ئەستۆ، ئیمامی ئەحمەد دەڵێ: لە تەمەنی ١٠ ساڵیدا دایکم قورئانی پێ لەبەرکردم، هەموو شەوێك پێش بانگی بەیانی لەگەڵ خۆی هەڵی دەستاندم، کاتێك لە بەغدا کەشوهەوا سارد بوایە ئاوی دەستنوێژی بۆ گەرم دەکردم، دواتر هەردووکمان نوێژمان دەکرد تا بانگی بەیانی، دواتر پەچە و عەبای دەپۆشی و دەچووینە مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی، دوای نوێژی بەیانی تا نیوەڕۆ لە مزگەوت دەماینەوەو وانەی پێ دەوتم.

دواتر کە تەمەنم بووە ١٦ ساڵ، دایکم وتی: کوڕم بچۆ بۆ فێربوونی زانستی فەرموودە، سەفەرکردن بۆ بەدەستهێنانی زانستی شەرعی، کۆچ (هیجرەت)کردنە لەپێناوی خوادا.

ئەمجا بوخچەی سەفەری بۆ پێچامەوە و وتی: خوای گەورە کاتێك شتێك پێ دەستپێریت دەیپارێزێت، دەتسپێرم بەو خوایەی سپاردەکانی زایە ناکات، لای دایکی ڕۆشت و چووە مەککە و مەدینە و سەنعا، تا گەڕایەوە و بووە ئەو (ئیمام ئەحمەد)ەی پێشەوای ئوممەت، ئەوەی پێی کرا لە زانستی شەرعی پێشکەشی ئوممەتەکەی کرد. ئەمانە پێشەنگ و نموونەی ئێمەن، نەك ئەکتەر و گۆرانیبێژەکان، ئایا نابێت بیانکەیتە پێشەنگی خۆت و سەرقافڵەی ڕێگاکەت، بەو هیوایەی خوای گەورە لەگەڵ ئەوانەدا حەشرت بکات و لە بەهەشتی نەبڕاوەدا بچیتە ڕیزی ئەوانەوە.

ڕەحمەتی خوا لەو شاعیرەی دەڵێ:

لو كان النساء كما ذكرنـــــا لفضلت النساء على الرجال

وما التأنيث لاسم الشمس عيبٌ وما التذكير فخر للـــهلال

(ئەگەر ئافرەت لەم شێوە بێ باسمانکرد، ئەوا فەزڵ و گەورەییان زۆر زیاترە لە.

نە (ت) تأنیثی (مێینە) بۆ ناوی خۆر نەنگییە، (خۆر مؤنثە لە عەرەبیدا)، وە نێرینەیی بۆ وشەی مانگ فەخر و شانازییە[1].

---

[1] تێبینی: (لە زمانی عەرەبیدا (شمس) بە مانای خۆر وشەیەکی مؤنث، واتە مێینەیە. وە (القمر) واتە مانگ وشەیەکی (نێر)ە مذکر). وەرگێڕ.

## ١٢- فاتیمە (زانا و فەقیهـ)

تەماشای ژیاننامەی فاتیمەی کچی شێخ عەلائەدینی سەمەرقەندی بکە، خاوەنی کتێبی (تحفة الفقهاء)، ساڵی ٥٣٩هـ وەفاتی کردووە، فاتیمە زانایەکی پایەبەرزبووە، یەکێ لە قوتابییەکانی باوکی دەیخوازێت بە ناوی (عەلائەدین کاسانی)، کە خاوەنی کتێبی (البدائع)ە، تیایدا ڕاڤە و شەرحی کتێبی مامۆستاکەی شێخ عەلائەدینی سەمەرقەندی کردووە.

زیرەکی و پڕ زانستی ئەم خاتوونە لەوەدابوو کاتێك هاوسەرەکەی هەڵەیەکی دەکرد خێرا بۆی ڕاست دەکردەوە، لە ماڵەکەی ئەماندا کاتێك لە ماڵی باوکی بوو فەتواکان دەردەچوون، دەبوو خەت و مۆری ئەم و باوکی پێوەبوایە، کاتێکیش شووی کرد بە زانای پایەبەرز کاسانی، باوکیشی وەفاتی کرد، ئیتر فەتواکان لە ماڵی ئەماندا دەردەکرا و مۆری باوکی و هاوسەرەکەی و خۆی پێوە دەبوو.

## ١٣- ژنێك بە مەزەنەی هەزار پیاو:

ئەم خاتوونە ناوی (خازندار)ە، هەموو ماڵەکەی وەقف کردبوو بۆ خوا، لە سەدەی بیستەمدا ژیاوە، لە قاهیرە کۆلێژی (أصول الدين)ی بونیاتناوە، کە چەندەها نەوەیان پێگەیاندووەو و زانایانێکی زۆر دەرچووی ئەو کۆلێژەن، لەوانە: (شێخ محمد غەزالی و یوسف القرضاوي) و چەندانیتر.

شێخ محمد غەزالی لە بارەیەوە دەڵێ: بەداخەوە هیچ لە بارەی ئەم ئافرەتەوە نازانین، ئەو ژینگە و سەردەمەی ئەوی تێدا ژیاوە، وابووە کاری ئافرەت بشاردرێتەوە و باس نەکرێت، ئافرەتێك بە تەنها و بە موڵك و سامانی خۆی کۆلێژێك بکاتەوە بۆ خوێندن و بڕوانامەی باڵاوە، هەروەها نەخۆشخانە و مزگەوت و پەناگەیەك کە هەر بەناوی خۆیەوە (خازندار)ە، چ دڵێکی پاك و بێ خەوش لە سینەیدا بووە؟ قەرزێکی باشی داوەتە پەروەردگاری تا لەو دونیا بە چەندانیتر وەریگرێتەوە، شتێکی لای خوا زەخیرە کردووە کە بۆ ئەو دونیای ڕووی سپی و سەری بەرزکات ﴿يَوۡمَ تَرَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَسۡعَىٰ نُورُهُم بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِم بُشۡرَىٰكُمُ ٱلۡيَوۡمَ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ الحديد: ١٢.

واتە: (ڕۆژێك دێت کە دەبینیت پیاوانی ئیماندار و ژنانی ئیماندار بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن، نور و ڕووناکییەك ئاشکرا لە پێشەوە و لەلای ڕاستیان دەدرەوشێتەوە، مژدەتان لێبێت بەو بەهەشتەی کە جۆگە و ڕووبار بە ژێر درەخت و کۆشکەکانیدا دێت و دەڕوات).

ڕەحمەتی خوا لە (خاتوو خازندارە)، کە ماڵ و سامانەکەی لە ڕێگای خوادا بەخشی و بووە هۆی دەستەبەرکردنی چارەسەری نەخۆش، زیندوو ڕاگرتنی ماڵی خوا، تێرکردنی سکی برسی، پەناگەی بێ سەرپەرشتان و زانستگە بۆ فێرخوازان، کارێکی کرد کە ژن و پیاو شانازی پێوە بکەن.

## ١٤- ئەو پاڵەوانانەی ئیسلام کە لەسەر دەستی ئافرەت موسڵمان بوون:

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت)، لەسەر دەستی (فاتیمە)ی خوشکی باوەڕی بەخوای تاك و تەنها هێناو هاتە ناو بازنەی ئیسلامەوە.

فاتیمە (سەلامی خوای لێبێت) پێش براکەی موسڵمان بوو بوو، کاتێك عومەر گوێی لێبوو خوشکەکەی قورئان دەخوێنێ و موسڵمان بووە زللەیەکی لێدا، ئەویش پێی وت: ئەی عومەر هەق و ڕاستی لە دینەکەی تۆدا نییە، من شایەتی دەدەم کە تەنها (الله) خودایە و (محمد)یش پێغەمبەری خودایە، ئەم قسەیە زۆر کاریگەری تێکرد، بۆیە چووە لای پێغەمبەر و دواتر موسڵمان بوو.

ئەبو تەڵحە کاتێك (أم سليم)ی هێنا هێشتا موسڵمان نەبووبوو، بەڵام (أم سليم) ئافرەتێکی موسڵمان بوو، ئەم ئافرەتە تێگەشتووە پێی وت: ئەی ئەبو تەڵحە ئایا ئەو خودایەی تۆ دەیپەرستی لە زەوی سەوز نەبووە، وتی بەڵێ وایە.

(أم سليم) وتی: ئەی شەرم ناکەی درەخت بپەرستی؟! ئەگەر موسڵمان بیت هیچ مارەییم لەتۆ ناوێ، هەموویت پێ دەبەخشم و تەنها موسڵمان بوونت مارەییمە.

ئەبو تەڵحە پێی وت: وازم لێبێنە تا بیری لێدەکەمەوە دواتر بڕیار دەدەم. ڕۆشت و هاتەوە ئەمجا وتی: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن

**محمدًا رسول الله**). بەم شێوەیە (أم سليم) بووە هۆی موسڵمانبوونی هاوەڵێکی وەك (ئەبو تەڵحە).

### ١٥- ئافرەتە بانگخوازەکان

ئەمە (ام شريك القرشية العامرية)، دەچووە ناو ژنان لە مەککە و ئامۆژگاری دەکردن و بانگی دەکردن بۆ ئیسلام، لەسەر ئەم کارە بەردەوام بوو تا قورەیشییەکان پێیان زانی، گرتیان بەستیانەوە و ئەشکەنجەیان دا.

ئافرەتێکیتر کە بانگخواز بووە (بنت سمرة بنت نهيك)ە، ئامۆژگاری ژنانی دەکرد و فەرمانی پێ دەکردن بە چاکە و بەرگری لێ دەکردن لە خراپە.

ئەوەش (خەولەی کچی مالیك)، جارێك لە ڕێگادا ئیمامی عومەری بینی، ئیمامی عومەر سەلامی لێکرد، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و پێی وت: ئەی عومەر ئەزانم لە بازاڕی مەککەدا بە عومەیر ناسرابووی، بە گۆچانەکەت منداڵانت دەترساند چەند ڕۆژ ڕۆیشت و تۆ بوویتە (عومەر)، دواتریش ڕۆژانێك بەسەرچوو تۆ بوویتە (أمير المؤمنين)، جا پێت دەڵێم لە خوا بترسە بۆ ژێردەستەکانت، بزانە ئەوەی لە خوا بترسێ و خەمی ڕۆژی دوایی بێ، ئەوا دووری بۆ نزیك دەکرێتەوە (خودای لێ نزیك دەبێتەوە)، ئەوەی لە مردن بترسێ خەمی لەناو چوونیەتی.

(جاروت) ئەو هاوەڵەی لەگەڵ حەزرەتی عومەر دا بوو، وتی: ئەی ئافرەت زۆر بلێیی دەکەی بەرامبەر گەورەی موسڵمانان.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: لێی گەڕێ، ئەی نایناسی؟ ئەمە خەولەیە خێزانی (أوس کوڕی صامت)ە، خوای گەورە لە حەوت ئاسمانەوە سکاڵا و گلەییەکەی گوێ لێگرت، ئێستا من گوێی بۆ نەگرم؟! لە کۆتایی ئەم باسەدا دەڵێین بۆچی ئەم کەڵە ئافرەتانە کە مێژوویەکیان تۆمارکردووە و ئیسلام شانازییان پێوەدەکات بەس نین بۆ ئەوەی ببنە پێشەنگ و سومبولی ژیانمان؟.



## وەرزی دووەم ئافرەت لەسەردەمی ئیسلامدا

دینی پیرۆزی ئیسلام باشترین ڕێزی لە ئافرەت گرتووە: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ البقرة: ٢٢٨.

### ١- ئامادەیی ئافرەت لە مزگەوتەکاندا:

ئافرەتان ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ بوون، هەروەها نوێژی هەینی کە لە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) کردوویانە، داوای لێکردوون ڕیزی دواوە تایبەت کەن بە خۆیان، تا لە دواتر بوونایە باشتر بوو بۆیان، لەبەرئەوەی ترسیان هەبوو لە دەرکەوتنی عەورەتی پیاوەکان و بینینی. لەسەرەتادا تەنها یەك دەرگا هەبوو لە مزگەوتەکە کە ژن و پیاو لەوێوە دەهاتن و دەچوون، ئەوەش قەرەباڵغی و تێکەڵی دروست دەکرد، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) فەرمانی کرد دەرگایەکی تر دروست بکرێ تایبەت بە ئافرەتان، ئێستاش ئەو دەرگایە لە مزگەوتی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) هەر بەوە ناسراوە (دەرگای ئافرەتان).

هەمیشە ئافرەتان ئامادەی نوێژی هەینی بوون و تەنانەت هەیانبووە سورەتی (ق) لە دەمی موبارەکی پێغەمبەرەوە لەبەرکردووە، کە لە نوێژی بەکۆمەڵدا دەیخوێند ئەوەندە ئامادەی نوێژەکان دەبوون.

هەروەها نوێژی جەژنەکان، لە هەردوو جەژنەکەدا ئامادەی نوێژ و وتار و ئەو ئاهەنگە ئیسلامییە دەبوون، ژن و پیاو و گەورە و بچووک تەکبیر و تەهلیلەی جەژنیان دەکرد.

موسلیم لە (ئوم عەتیە) دەگێڕێتەوە: فەرمانمان پێکرا بەیانی زووی جەژن بێینە دەرەوە بۆ نوێژ، زووتر بەر لە کاتەکەی دەچووین و لە پەنادا.

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرمووێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردین کچە تازە پێگەشتووەکان و ئەو ئافرەتانەش لە سوڕی مانگانەدابوون بێنە دەرەوە بۆ جەژنەکانی ڕەمەزان و قوربان، بەڵام ئافرەتەکان کە لە سوڕی مانگانەدابوون، تەنها لە دوورەوە دەوەستان و گوێیان لە وتارەکە دەگرت و لەو خۆشییەی جەژن بەشداردەبوون. (ئوم عەتیە) دەڵێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد کە هەمانە عەبای نییە، چۆن بێتە دەرەوە، ئەویش فەرمووی: با خوشکەکەی بەشی بدات، واتە هەر کەس زیادەی هەیە بیانداتێ.

❊❊❊

## ٢- ئافرەتان و بەشدارییان لە کۆڕی زانست و خوێندندا:

ئافرەت هەمیشە ئامادەی وانەکان دەبوون بۆ فێربوونی زانست و تێگەیشتن لە دینەکەیان، لە خزمەت پێغەمبەردا هەموو جۆرە پرسیارێکیان دەکرد تایبەت بە کاروباری ئافرەت، حەزرەتی عائیشە لە وەسفی ژنانی ئەنساردا دەفەرموێ:: شەرم ڕێگر نەدەبوو لە شارەزایی لە دینەکەیان و هەموو جۆرە پرسیارێکیان دەکرد، لە بێ نوێژی و لەشگرانی و غوسڵ و هەموو جۆرە پرسیارێك کە تایبەت بوون بە ئافرەتان، حەزیان بۆ فێربوونی زانستی شەرعی وای لێکردن داوایان کرد لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کە ڕۆژێکیان بۆ تایبەت بکات و بەجیا لەگەڵ براکانیاندا بن، تاوەکوو کاتی زۆرتریان هەبێ و پرسیارەکان ڕاشکاوانەتر بکەن، ئەوەبوو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێکی بۆ تەرخانکردن و وانەی شەرعی پێ دەوتن. (رواه البخاري)

## ٣- ئامادەیی ئافرەت لە جەنگەکاندا:

ئەم چالاکی و بەشدارییەی ژنان سەریکێشا بۆ بەشداریکردن لە جەنگ و خزمەتکردنی سوپا و سەربازانی ئیسلام، بە باشترین شێوە بەم کارە قورسە هەڵدەستان. هەر لە کاری برین پێچی و فریاکەوتن و چاودێری بریندااران، لە پەنای ئەمانەشدا سازکردنی خواردن و بردنی ئاو بۆ گۆڕەپانی شەڕ، ئامادەکردنی ئەوەی پێویست بوو لە شتومەك و تفاقی مەدەنی بۆ موجاهیدەکان.



ئوم عەتیە دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا بەشداری حەوت غەزام کردووە، خواردنم بۆ دروست دەکردن برین پێچیم دەکرد بەدیار نەخۆشەکانەوەو دەبووم و خزمەتم دەکردن.

موسلیم لە ئەنەس دەگێڕێتەوە: خاتوو عائیشە و ئوم سولەیم لە ڕۆژی ئوحود دا زۆر بەڕێکوپێکی کاریان دەکرد، کونە و مەشکەکانیان پڕ دەکرد لە ئاو بە کۆڵ دەیانبردە ناو شەڕەکە و دەیاندایە موجاهیدەکان، دواتر دەیانبرد پڕیان دەکردەوە.

هەموو ئەو کتێبانەی باس لە جەنگەکان دەکەن خاڵی نین لە ڕۆڵی پاڵەوانێتی ژنانی ئەو سەردەمە، ئەوە ڕۆڵی نوسەیبەی کچی کەعب کە بە (أم عمارە) ناسراوە لە شەڕی ئوحوددا چوو ئاو بۆ موجاهیدەکان بەرێت، کاتێك شکستی موسڵمانەکانی بینی، خێرا ئەوەی لە دەستی بوو داینا و شمشێرێکی هەڵگرت و چووە ناو گەرمەی شەڕەکەوە بۆ بەرگری لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بریندار‌بوو ژیانی دونیای بەخشی بە مردن تا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ژیاندا بمێنێ، تاڵاوی مەرگی نۆشی بۆ سەرکەوتنی حەق و نەهێشتنی بەتاڵ.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نزای بۆ خۆی و هاوسەر و کوڕەکەی کرد، لەبارەیەوە دەفەرمووێ: (ما نظرت يمينا ولا شمالًا إلا ورأيت أم عمارة)، لە شەڕەکەدا تەماشای هەر لایەکم دەکرد لە ڕاستم لە چەپ هەر ئوم عەمارەم دەبینی، ئەمجا بە کوڕەکەی فەرموو: (پێگە و مەقامی دایکت لە زۆر کەس (فلان و فلان) باشترە).

ئیمامی ئەحمەد دەگێڕێتەوە: شەش ئافرەت لە ئافرەتە موسڵمانەکان لە سوپای ئیسلامدا بوون، لە پاڵ برا موجاهیدەکانیاندا بوون کاتێك گەمارۆی خەیبەر درا، تیریان دەدایە دەست جەنگاوەرەکان، ئاویان دەدایە سوارییەکان و برینداریان تەداوی دەکرد، شیعریان دەوت بۆ ورەی شەڕکەران لەپێناو خوادا، لەبەرامبەر ئەم بەشدارییەیان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە غەنیمەی شەڕەکەی بەشی دان هەروەك براکانیان بەریان کەوت، هەروەها ئوم سولەیم ڕۆژی (حنین) خەنجەرێکی پێبوو سکی ئەو کەسەی دەدڕی لێی نزیك بوایەتەوە، موسلیم لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە: دایکم (ام سلیم) ڕۆژی (حنین) خەنجەرێکی هەڵگرتبوو ئەبو تەڵحەی هاوسەری بینی، عەرزی پێغەمبەری کرد بڕوانە ئوم سولەیم خەنجەری هەڵگرتووە.

پێغەمبەر فەرمووی: (ئەم خەنجەرە چییە ئوم سلیم) وتی: ئەوە هەڵمگرتووە تا هەر بێباوەڕێك نزیك بوویەوە بیکەم بە سکیدا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستی کرد بە پێکەنین.

ئیمامی بوخاری لە (صحیح)ەکەیدا باسێکی تایبەت کردووە بە جەنگاوەری ئافرەتان و بەشدارییان لە غەزاکاندا. لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) ئافرەتان تەنها بەوەوە نەوەستاون لە شەڕە نزیکەکان، کە لە ناوچەی نیوە دوورگەی عەرەبیدا ڕوودەدات بەشداردەبن وەك (حنین) و (خەیبەر)، بەڵکوو بۆ بەشداری لە شەڕ هاوشان لەگەڵ برا و هاوسەرە موجاهیدەکانیاندا دەریاکانیان دەبڕی و

له فەتحی وڵاتە دوور دەستەکاندا بەشداربوون بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلام.

له صەحیحی بوخاری و موسلیم دا له ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە: له سەفەرێکدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ کەمێك حەوانەوە چووینە ماڵی پورم (أم حرام کچی ملحان)، لەوێ سەرخەوێکی شکاند، که خەبەری بوویەوە پێکەنی، ئوم حەرام دەڵێ:

وتم ئەی پەیامبەری خوا بەچی پێدەکەنی؟ فەرمووی: (کەسانێك له ئوممەتەکەمم پیشاندرا جەنگاوەبوون لەپێناوی خوادا، وەکوو پاشاکان لەسەر تەختی پاشایەتی سواری شەپۆلەکانی ئەم دەریایە دەبوون).

(أم حرام) دەڵێ عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نزام بۆ بکە منیش لەو خەڵکانەبم. پێغەمبەریش نزای بۆ دەکات.

لەسەردەمی حەزرەتی عوسماندا (سەلامی خوای لێبێت) ئوم حەرام لەگەڵ (عبداللەی کوڕی صامت)ی هاوسەریدا بەسەر ئەو دەریادا چوون بۆ (قوبرس) که لەژێر دەسەڵاتی موسڵماناندا بوو. دواتر لەوێ لەسەر ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە وەفاتی کرد، هەر لەوێ ناشتیان (وەك ئەهلی سیرە و مێژوو دەگێڕنەوە).



## ٤- بەشداری ئافرەت لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا:

لەژیانی کۆمەڵایەتیشدا ئافرەتانی موسڵمان بەشدارییەکی کارایان هەبووە بۆ ڕێنمایی کۆمەڵگە و ئاراستەکردنی خەڵکی بە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە.

وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾ التوبة: ٧١.

واتە: (ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتان پشتگیر و هاوکاری یەکترن، فەرمان بە چاکە دەکەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن).

لەو ڕووداوانەی زۆر باسکراوە لەم بارەیەوە، وەڵامدانەوەی یەکێ لە ئافرەتە ئیماندارەکانە بەرامبەر حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لە بارەی مارەییەوە، پاشگەز بوونەوەی ئیمامی عومەر لە ڕاکەی کاتێك فەرمووی: (أصابت امرأة وأخطأ عمر)، تەفسیری ابن کثیر دەڵێ: سندها جيد.

(ئافرەتێك پێکای (واتە: ڕاستی کرد) عومەر هەڵەی کرد)، حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) لە سەردەمی خیلافەتی خۆیدا (شیفای کچی عبدالله)ی کردە سەرپەرشتیاری کاروباری بازاڕەکان.

❊❊❊

## ٥- ئافرەتێك نەزر دەكات بۆ خوا:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (حبيب كوڕی یەزید) دەنێرێت بۆلای (موسەیلەمەی كەزاب) تا قسەی لەگەڵ بكات و بگەڕێتەوە سەر ڕێگای ڕاست.

(حەبیب) گەنجێكی ئیمانداری ئازابوو، كاتێك موسەیلەمەی درۆزن بینی، بڕیاریدا بیكوژێت، سەرەتا لێی پرسی ئایا شایەتی دەدەی محمد نێردراوی خوایە، وتی: بەڵێ.

موسەیلەمە وتی: ئەی شایەتی دەدەی من نێردراوی خوام، خۆی لێ كەڕ كرد و بە ئاماژە وتی گوێم لێنەبوو، دووبارەی كردەوە بۆی، دووبارە حبیب زۆر بە گاڵتە پێكردنەوە تەماشای كرد و بێ دەنگ بوو، موسەیلەمە ئەم گەنجەی پارچە پارچە كرد، هەر كە لێی دەپرسی باوەڕم پێ دێنی، (حەبیب) دەیگوت: نا پارچەیەكی تری لێ دەكردەوە تا خوێن لە هەموو جەستەی بەربوو، گیانی سپارد و چوویەوە لای پەروەردگار.

دایكی كاتێك هەواڵەكەی پێگەیشت، هەواڵی شەهیدبوونی كوڕەكەی، نەزری كرد كە تا تۆڵەی كوڕەكەی نەكاتەوە و موسەیلەمە نەكوژێت خۆی نەشوات. ئەم ئافرەتە لەگەڵ عبداللەی كوڕیدا دەڕوا و بەشداری لە جەنگی (یەمامە)دا دەكات، لەگەڵ سوپاكەی موسەیلەمەدا زۆر بە توندی شەڕ دەكات، لە پێشەوەی شەڕەكەدا بوو، دوانزە جار دەپێكرێت و بریندار دەبێ، دەستێكی دەپەڕێ، بەڵام هەر واز ناهێنێ و

بەردەوام دەبێ لە جەنگ تا موسەیلەمە دەکوژێت، بەڵێ، هەق و ڕاستی سەردەکەوێ و بەتاڵ سەرشۆڕ و ڕیسوا دەبێت.

ئەمجا کاتێك ئەم ئافرەتە کە (نوسەیبەی کچی کەعب)ە نەزرەکەی بردە سەر و گەڕایەوە و خۆی شووشت. ئایا کاتێك چووە دەرەوە بۆ جەنگ، کەس توانی ڕێگری لێ بکات؟ نا، چونکە پێشتریش لە جەنگی (ئوحود)، بەیعەتی (ڕەزوان)، فەتحی مەککە، هەروەها ڕۆژی (حنین) و لەپێش ئەمانەش بەشداری پەیمانی (عەقەبە)ی کردبوو.

ئەمە نموونەی ئافرەتێکی ئیماندار و بۆ خوا تێکۆشاوە کە بووە هۆی ڕێز و سەربەرزی بۆ خێزان و ڕێبازەکەی.

## ٦- خاتوو (خەنسا) پێش و پاش موسڵمانبوونی:

ئەمە خاتوو خەنسایە، ئەو ئافرەتەی کۆمەڵێك جەنگاوەری پاڵەوانی پێگەیاند و پێشکەش بە ئیسلام کرد، ئەو چوار کوڕی لە شەڕی قادسیەدا بە دڵێکی ئاسودە و ڕەزامەند کردە قوربانی بەرنامەکەی خوا، بیخوێننەوە و بزانن کاتی بەڕێکردنیان بۆ جەنگەکە چ ئامۆژگارییەکی کردوون؟!

(کوڕەکانم، ئێوە ملکەچی بەرنامەکەی خوابوون و موسڵمان بوون، خۆتان کۆچ کردنتان لە پێناو خوادا هەڵبژارد، بزانن ڕۆژی دوایی وماڵی کۆتایی باشترە لەم دونیا کەم بایەخ و بەسەرچووە، ئارام بگرن و پێگەتان قایمکەن و لەخوا بترسن، تا خوای گەورە پشتیوانتان بێت و سەرتان بخات، ئەگەر بینیتان جەنگ تاوی سەندووە و لە هەموو

لایەکەوە ئاگر دەبارێ و تیر و نێزەکانتان قورس بوون و کەس خۆی پێ نەگیرا، ئەوا ڕاوەستاوبن و بەردەوام بن، دەستکەوت وماڵ و دارایی و کەرامەت لە قیامەتی نەبڕاوە وماڵی هەتا هەتاییتاندا بە دەست بێنن، چەندە جەنگ گەرم بێ و کەڵبەکانی جیڕ کردەوە ئێوە زیاتر و بەهێزتر بەرگری بکەن، گیانی خۆتان بەخت بکەن لەپێناو خوای پەروەردگار و سەرکەوتنی دینەکەی و بەرز ڕاگرتنی کەلیمەی (لا إله إلا الله)، بەم شێوەیە بەڕێی کردن بۆ جیهاد، لەو شەڕەدا هەر چوار کوڕەکەی شەهید بوون، کاتێك هەواڵەکەیان پێگەیاند دەستبەجێ وتی: سوپاس بۆ خوا کە شەرەفی شەهیدبوونی هەموویانی پێ بەخشیم، داواکارم لە خوا لەژێر سێبەری ڕەحمەتی خۆیدا لەگەڵیان کۆم بکاتەوە، ئافرەتێك چوار کوڕی شەهید بێت نە گریانێ، نە هاوارێك، نە خۆڕنین و لاواندنەوەیەك!!

چونکە دەیزانی ئەوان پێشی کەوتن بۆ بەهەشت و ئەمیش بە ویستی خوا پێیان دەگات بەرەو بەهەشتێکی نەبڕاوە، کە پانتاییەکەی بەقەد زەوی و ئاسمانەکانە و ئامادەکراوە بۆ خواویستان و لەخوا ترسان. بێگومان بیستوومانە هەر ئەم خەنسایە پێش موسڵمانبوونی کاتێك براکەی دەمرێت چۆن شەو و ڕۆژ دەیلاواندەوە و پیاهەڵدەدا.

## ٧- بەشداری ئافرەت لە جەنگەکاندا:

بەدرێژایی مێژووی ئیسلام ئافرەتان ئامادەییەکی بەرچاویان بووە لە شەڕەکاندا، لە جەنگی (یەرموك)دا موسڵمانان ڕووبەڕووی جەنگێکی

زۆر سەخت بوونەوە، هەر کاتێك لاواز بوونایە یا ڕیزەکانیان بۆشایی تێکەوتایە، ئافرەتەکان کە لە پێشیانەوەبوون دەچوونە سەر بەرزایی تەپۆلکەکان و موسڵمانانیان بۆ شەڕکردن و نەبەزین هان دەدا، نەیاندەهێشت برا و کوڕ و هاوسەرەکانیان پاشەکشەبکەن و مەیدان چۆڵ بکەن. گەر بیانزانیایە بەرەو دواوە دێن بەردیان تێدەگرتن، ئەچوونە بەرپێی ئەسپەکانیان تا سوپاکەیان لارسەنگ نەبێ و بەرامبەر زاڵ نەبێ بەسەریاندا.

لە کتێبی (فتوحاتی شام)ی (الواقدی) دا هاتووە: کە ئەبوسوفیان لە ئەبوعوبەیدەی جەڕاحەوە دەڵێ: ئەی ئەمیری موسڵمانان فەرمان بکە ئافرەتەکان بچنە سەر بەرزاییەکان.

ئەبوعوبەیدە هاوار دەکات: ئەی ئافرەتانی ئیماندار کۆڵەکەی چادرەکان بگرن بەدەستانەوە و بەرد هەڵگرن، براکانتان هاندەن بۆ شەڕکردن، ئەگەر هەر دەستکەوت و غەنیمەیەك بۆ ئێمە هەبێت بۆ ئێوەش هەیە، ئەگەر بینیتان یەکێ لە براکانتان شکست دێنێ و پاشەکشە دەکات، بە دارەکانی دەستتان ڕێگرییان لێ بکەن، مناڵەکانتان بەرز بکەنەوە و بڵێن بڕۆن بۆ بەرگری لە ئیسلام و موسڵمانان.

ئافرەتەکان یەك دەنگ بەدەم داوکارییەکەیەوە چوون و وتیان: ئەی پێشەوا موژدە بێ ئەوە دەکەین کە پێت خۆشە، کاتێك تەنوری شەڕ تاوی سەندو ڕۆمەکان بەهێزبوون بەسەر موسڵمانەکاندا، چونکە ژمارەیان زۆر زیاتربوو، ئەسپ و ئاژەڵە سوارییەکان لە تاو گەرمی

شەڕەکە بەرەو دواوە دەهاتن و نەیان دەتوانی بچنە پێشەوە، موسڵمانان هێزیان لێ بڕابوو، کاتێك ئافرەتانی سەر بەرزاییەکان ئەم دیمەنەیان بینی کە موسڵمانان لە پاشەکشەدان و خەریکە شکست دێنن، هاواریان کرد ئەی کچانی ئیماندار.. ئێوە لەبری پیاوەکان وەرنە مەیدان، بیانگەڕێننەوە تا دەچنە گۆڕەپانی جەنگ، (سەعیدەی کچی عاصم) دەڵێ: ئێمە لەو کۆمەڵەبووین کە ئەو ڕۆژە لەسەر بەرزایی و تەپۆڵکەکان بوین.

ئافرەتان بە هاوسەرەکانیان دەوت: ئێوە پیاوی ئێمە نین گەر نەجەنگن و ڕێگری نەکەن لە هاتنی ئەو بێباوەڕ و گومڕانە (مەبەستیان ڕۆمەکان بوو)، (خەولەی کچی ئەزوەر) یەکێ بوو لەو ئافرەتانەی بەشیعرەکانی گڕووتینی دەدایە موجاهیدەکان و هانی دەدان بۆ جیهاد.

بەم شێوەیە سوارچاکەکان گەڕانەوە مەیدانی شەڕ و یەکترییان هاندەدا، هێرشیان کردە سەر دوژمن و زەفەریان پێ بردن. (هندی کچی عوتبە) کە چاوی کەوت بەو سوارییانەی دەگەڕێنەوە، چووە پێشەوە لێیان و هاواری کرد: بۆ کوێ پاشەکشە دەکەن؟ ئایا لە خوا و بەهەشتەکەی ڕادەکەن؟ لەخوایەك ڕادەکەن کە چاودێر و ئاگادارە بەسەرتانەوە؟!

تەماشای کرد ئەبوسوفیانی هاوسەری بە بەزیوی دەگەڕایەوە، بە دارەکەی دەستی دای لە دەموچاوی ئەسپەکەی و وتی: بۆ کوێ ئەی کوڕی صەخر؟ بگەڕێوە بۆ شەڕ هەموو هەوڵێکت بخەکار بۆ بەرگری لە ئیسلام هەتا ئەو کارانەی پێش ئیسلامەتیت دژی پێغەمبەر (صلى الله

علیه وسلم) ئەمجامت دەدا پاك بێتەوە و ڕووی خۆت سپیکەرەوە، ئەبو سوفیان کاتێك ئەم قسانەی بیست سۆزی خرۆشاو غیرەت گرتی گەڕایەوە بۆ شەڕ و موسڵمانانیش لەگەڵی گەڕانەوە.

(زوبەیری کوڕی عەوام) (سەلامی خوای لێبێت) دەڵێ: لەو ڕۆژەدا چەندین دیمەنم بینی، کە ئافرەتان ئازایانە پێشبڕکێیان لەگەڵ پیاواندا دەکرد لە مەیدانی شەڕدا، لەنێوانی سوارییەکاندا ئافرەتێکم بینی بەرەو ڕووی یەکێ لە ڕۆمەکان چوو، یەخەی گرت و تا لەسەر ئەسپەکەی نەیخستە خوارەوە بەرینەدا.. دەیگوت: ئەمە بە ئاشکرا نوسرەت و پشتیوانی خوایە بۆ موسڵمانان.

ئەمە وێنەیەکی پرشنگدارە لە وێنەی پاڵەوانێتی ژنانی موسڵمانان کە پێویستە ئەمڕۆ ئافرەتان هەڵوەستە لەسەر ئەو ڕۆڵە کاریگەرەیان بکەن کە هەیانبووە ئەو ئازایەتی و گیان فیدایی و چاونەترسییەی بۆ بەرگری لە دینەکەیان تیایاندا بەرجەستەبوو، چەندە پێویستە ئەمڕۆ ئافرەتان شانازی بکەن و دڵخۆش بن بەو ئافرەتانەی بەشدارن و پشکیان هەیە لە دروستکردنی مێژووی ئیسلامیدا بە درێژایی سەدەکان.



## وەرزی سێهەم ڕەوشتی کچی ئیماندار

پێویستە کچانی ئیماندار بە چەند ڕەوشت و ئاکارێکی جوان خۆیان بڕازێننەوە و کەسێتی خۆیانی پێ بپارێزن، وەك ئەمانەی لە خوارەوە باسی دەکەین:

### ١- زۆربڵێ مەبە:

لەوە باشتر نییە لە کاتی هەرا و ژاوەژاودا بێ دەنگ بێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (ئەو کەسەی باوەڕی بەخوا و ڕۆژیی دوایی هەیە یا با قسەی خێر و چاکە بکات، یا بێدەنگ بێت). متفق علیه.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێ: ( بەندە کاتێك قسەیەك دەکات ڕەزامەندی خوای تێدابێ، ئەوا خوای گەورە پلەی بە چەند قات بەرزدەکاتەوە بەهۆی ئەو قسە خێرەوە، بەڵام ئەگەر قسەیەکی کرد توڕەیی و خەشمی خوای تێدابوو، ئەوا بەرەو دۆزەخی دەبات) (بوخاری).

(ئەبو دەرداء) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: بزانە کە خوای گەورە هەروا دوو گوێ و یەك زاری پێ نەبەخشیویت، بەڵکوو بۆ ئەوەیە زیاتر

بیبیستی و کەمتر قسە بکەیت. (فوزەیلی کوڕی عەیاز) دەڵێ: موسڵمان قسەی کەمە و کرداری زۆر، بەڵاو دووڕوو قسەی زۆرە و کرداری کەم.

## ٢- لە عەیب و عاری خەڵکی مەڕوانە:

هەمیشە هەوڵبدە عەیب و ناتەواوییەکانی خۆتەوە خەریکبە و چاکیان کە، لە بری ئەوەی لە عەیبی خەڵکی بڕوانی. (زین العابدین) دەڵێ: زانینی عەیب و ناتەواوییەکانی خۆت بەخششێکی خواییە.

بێگومان وایە، ئەو دەڵێ: (هەر کەسێك بۆ عەیب و عاری خەڵکی گەڕا، ئەوا لە خراپە و عەیب و ناتەواوی خۆی بێ ئاگا و غافڵ دەبێت)

(سڕی سەقەطی) زۆر دەترسا لەو پەتایە (گەڕان بەدوای عەیبی خەڵکیدا) و دەڵێ: هیچ شتێکم نەدیوە کاروکردەوەکان پووچەڵ بکاتەوە، دڵنەخۆش بکات و بەندە بە هیلاکا بەرێت و خەفەت و خەم بەدوای خۆیدا بێنێت، لەوەی کە بەندە خۆی نەناسێت و بەدوای عەیب و عاری خەڵکیدا بگەڕێت).

## ٣- واز بێنە لە قسەی پووچ و بەتاڵ:

(ابن رواحه) دەستی (أبو درداء)ی دەگرت و پێی دەوت: وەرە با سەعاتێك ئیمانمان پتەوکەینەوە، باسییان لە بیروباوەڕ و گەڕانەوە بۆلای خوا، وە چۆن دەروونی خۆیان چاککەن و چاکسازی لەناو خەڵکیدا بکەن.

(میمون) دەچووە لای گەورەی تابیعین (حەسەنی بەصری)، دەیدا لە دەرگاکەی دەیوت: ئەی ئەبا سەعید دڵم ڕەق بووە، بەو چارەسەرەی لاتە نەرمیکەرەوە بە ئامۆژگاری و زیکری خوا.

ئەگەریش تەنها بوویت و هاودەمت نەبوو، ئەوا دەتوانی ئەوکاتەت شیرین بکەیت بە موناجات و ڕاز و نیاز لەگەڵ پەروەردگارت، هاوەڵان و شوێنکەوتووان چەند بنەمایەکیان دانابوو بۆ پاککردنەوەی دڵ و دەروونیان.

- با دانیشین و ساتێك ئیمانمان زیاد کەین.
- با پێکەوە دانیشین ئەوەی نایزانین فێربین.
- دڵم ڕەق بووە، با بە ئاوی ئیمان پاراوی بکەین.
- وەرن بڕۆین بۆ ڕاز و نیاز لەگەڵ خوا.

ئەمانە هەموو ئاماژەی کردەیین کە دەتبەن بەرەو ڕێگا و ڕێبازی پەروەردگار.

## ٤- ڕاستگۆبە:

درۆ و ئیمان هەرگیز لە دڵی باوەڕداردا جێیان نابێتەوە، درۆکردن لای ئافرەتان چەند هۆکارێکی هەیە، لەوانە: (زیادەڕۆیی، لەخۆبایی، خۆهەڵکێشان، حەزکردن بە جیاوازی)، ئەمانە شتانێکن کە دەتخەنە نێو درۆوە و وات لێدەکەن ڕابێیت لەسەر درۆکردن، هەندێك ئافرەت زۆر زیادەڕەوی دەکەن لە قسەکانیاندا، قەینا زیادەڕەوی تا سنورێکی مەعقول بێ، کە ئەمە ئەچێتە بابی (لغو) هەڵە و بێ مەبەست، وەك

بڵێی ٢٠ جار تەلەفۆنم بۆ کردی وەڵامت نەدایەوە، کە لەوانەشە هەمووی (٥) جار کردبێتت. یا بڵێی بە منداڵەکەت (١٠٠) جارم وت بەوە یاری مەکە، کە خۆی لەوانەیە سێ جار زیاتر نەبووبێت، ئەمانە بەڕاست وەرناگیرێن، چونکە دەم پێی ڕاهاتن و قسەی باوی ناو خەڵکە، بەگشتی کە بەرامبەریش زانی وایە وەریناگرێ و بەدرۆ و زیادەڕەوی هەژمار ناکرێن، بەڵام هەر نەکرێن باشترە. مرۆڤی لەخواترس لەم دەستەواژانە خۆی لادەدا با لای خەڵکیش ئاسایی بێت.

دەگێڕنەوە یەکێك لە خواناسەکان پوری دێ بۆ سەردانی دەڵێ، کوڕەکەم چۆنی؟

دەڵێ: ئایا تۆ منت بووە؟

دەڵێ: نەخێر.

دەڵێ: ئەی شیرت پێداوم؟

دەڵێ: نا.

دەڵێ: ئەی باشتر نەبوو پێم بڵێی برازاکەم تانەبێتە درۆ.

تەماشای ئەو هەستیارییە بکەن کە لە خواترسان هەیانبووە بۆ درۆ و قسەی ناڕاست، تەنانەت ئەو قسەیەش لەناو خەڵکیدا باوە و ئاساییە، چۆن هەستی ئیمانییان ڕەتیدەکاتەوە. خۆدەرخستن و خۆهەڵکێشان نەخۆشییەکی مەترسیدارە کە زۆرێك لە ئافرەتان تووشی دەبن، ئافرەتە موسڵمانەکانیش لێی قوتار نابن.

دەبینی هەندێك ئافرەت کچیان هەیە لە دەمی شووکردندایە، وەسفی بێسنوری دەکەن، هەندێك شت دەڵێن بۆخۆهەڵکێشان هیچ

کات عەقڵ قبوڵی ناکات، هەرچی حەزکردن بە جیاوازیشە لای زۆرێك پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ کەوتنە درۆکردنەوە، ئەمەش ئەو کەسانەی دەیکەن هەمیشە هەست بە کەموکورِی و ناتەواوی دەکەن، بۆیە دەستدەکەن بە خۆهەڵکێشان لەبەر پڕکردنەوەی ئەو کەموکورِییە لە ناخیاندا. بۆ نموونە ئەگەر لای ئەم جۆرە کەسانە بڵێی منداڵەکەم یەکەم بووە، لە خێزانەکەیدا کێ یەکەم بووە؟ دەیڵێ ئەگەریش نەبوو ئەوا دەست دەکات بەدرۆکردن و دروستکردنی قسەی ناڕاست، وەك هەستکردنێك بە کەمی یا (خۆ بەکەم زانین).

زۆر ئاگاداربە خوشکم لەم ڕەفتارانە، مەهێڵە بەبێ ئاگایی ڕاتکێشن بەرەو درۆکردن، بێ ئەوەی خۆت هەستی پێ بکەی.

پێویستە لەسەرت گرنگی بە کەسانی دەوروبەرت بدەیت، بەڵام بێ زیادەڕۆیی، قسە و خۆش دوویی بە شەرعی و عورفی شتێکی ڕێپێدراو و خوازراوە.

کاتێك دەوروبەرت پێویستیان بە هاوکاری بوو بە هانایانەوە بچۆ، هەر سیفەتێکی باشەیان تێدابوو بیڵێ و وەسف و سەنایان بکە، ئەگەر لای خۆشیاندا نەبێت باشتر. چەندە خۆشە کاتێك قسەی کەسێکت پێ دەگاتەوە، کە لەلای کەسانیتر و بێ بوونی خۆت مەدح و سەنای کردوویت.

سوربە لەسەر باسی باشەی خەڵکی و وەسفی سیفاتە جوانەکانیان، بەڵام ئاگاداربە لەوەی مەدحێکیان بکەیت و تیایاندا نەبێت، ئەمە لە لایەکەوە درۆیە، لەلایەکی تریشەوە دەتبات بەرەو دووڕوویی (نیفاق).

## ٥- به دڵسۆزی کارەکانت ئەمجام بدە:

شوانێك پرسیاری لە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) کرد ئایا بۆچی گورگ پاسەوانی مەڕ و ماڵات دەکات؟ عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: چونکە من نێوانی خۆم و خوام پاك ڕاگرتووە و دڵسۆزم بە کارەکانم، گورگیش بە دڵسۆزی پاسەوانی مەڕ و ماڵات دەکات.

تۆبە بکە لای خوای گەورە لە هەر ڕیایی و ڕووپامایییەك، کە تۆ نایزانی و خوای گەورە پێی ئاگادارە.

یا نزاکەی حەزرەتی (ئەبو بەکر) (ڕەزای خوای لێبێت) بکە، کە دەیفەرموو: کاتێك خەڵك مەدح و سەنایان دەکرد دەیوت: (اللهم إني أستغفرك مما علمت ومما لا أعلم.. اللهم إنك أعلم بنفسي مني فاغفر لي ما لا يعلمون.. واجعلني خيرًا مما يظنون).

- پەروەردگارا داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم لەو تاوانانەی دەیزانم، یاخود بە نەزانی و بێ ئاگایی ئەمجامم داوە، خوایە تۆ لەخۆم زاناتری بەمن، دەسا لێم خۆشبە لەوەی نایزانن و بمخەرە جێی گومانی خێریانەوە کە بە من هەیانە).

پیاوچاکێك دەڵێت: (خەسارۆمەندم ئەگەر لە دینەکەمدا زیادەڕۆیی بکەم و خەڵك وابزانن عابیدم).

ڕەحمەتی خوا لەو کەسەبێت کە وتی: کەسانێك خوای گەورە تاوانەکانی داپۆشین و ئابڕوی نەبردن، بە مەغروربوون و وەسف و مەدحی خەڵکی هەڵی خەڵەتاندن، هەرگیز مەهێڵە نەزانین و بێ ئاگایی

خەڵکی بەتۆ زاڵ ببێ بەسەر ناسینی خۆتدا، تۆ لە نیەت و ناخی خۆت بەئاگاییت، بە سەنای خەڵکی غروورو مەبە).

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿بَلِ ٱلۡإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ بَصِيرَةٞ ۝ وَلَوۡ أَلۡقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ۝﴾ القيامة:١٤ – ١٥.

واتە: (لەو ڕۆژەدا ئینسان خۆی چاك دەبێتەوە (هەموو ڕەفتار و گوفتاری تۆمارکراون)، هەرچەندە پاکانە بکات و بیانوو بێنێتەوە).

هەڵەی گەورە ئەوەیە ژیانی دەوروبەرت ڕێکخەیت و واز لە سەرلێتێکچوون و پشێوی ناخی خۆت بێنیت. بزانە، موسڵمانی ڕاست وەکوو زەوییەکی پاراوی سەوزی پڕ خێرە، بەروبوومەکەی باڵا دەکات و شین دەبێت و خەڵکی سودمەند دەبن لێی، هەیانە سوپاسگوزارە و هەیانە سپڵە و بەدنمەك، زەوییەکەش هەر بەو پاراوییە دەمێنێتەوە و سپڵە و بەدنمەکەکان کار لە سود و بەرەکەتەکەی ناکەن.

نموونەی موسڵمانی ڕاستگۆ و دڵسۆز، وەك ئەو پارچە ئاسنە پتەوە وایە کە ئاسنگەر کاری لەسەر دەکات، هەرچەندە بە توندی چەکوشی لێ بدرێ ناجوڵێ و نالەرزێ، لەسەرخۆ و ڕازین بەوە، چونکە سود و قازانجیان پێیە بۆ خەڵکی.

ئایا چوویتەتە مزگەوت تەماشای خوشکەکانت بکەی، یەکێ قورئان دەخوێنێت، یەکێك نوێژی سوننەت دەکات، یەکێك خەریکی خوێندنەوەی کتێبی بەسودە.. ئەم دیمەنە بەراورد بکە، چەندە جیاوازە لەگەڵ ئەو دانیشتنانەی کۆمەڵێ ئافرەت دانیشتوون و گۆشتی خوشك و براکانیان دەخۆن بە غەیبەت کردن، گاڵتە پێکردن، قسە

هەڵبەستن و باسکردنی نهێنی خەڵکی. یاخود قسەی بێ مانا و بێ سود، لەولاشەوە بەراوردی بکە بەو کچانەی سەرگەردان لە مۆڵ و شەقامەکاندا، چاوەڕێی هاوڕێی کوڕ و کەسانی نامەحرەمن لەگەڵیان بەسەربەرن، یان دانیشتوون لەسەر ئینتەرنێت و بەردەم کەناڵەکان، قسە لەگەڵ کەسێك دەکات کە پێی ڕادەبوێرێت و گاڵتە بە شەرەف و ناموسی دەکات.

تو خوا بەراوردی بکە و بزانە کامیان ژیانی کامەرانی و خۆش بەختییە و ئارامی دەروونی تێدایە؟!

### ٦- بەڵێنەکانت ببەسەر

نەبردنە سەری بەڵێنەکانت کارێکی مەترسیدارە، چونکە لەوانەیە لەسێ شتەوە سەرچاوەبگرێت:

١) لاوازی ئیمان ٢) خۆپەرستی ٣) بێباکی، بەڵێن نەبردنە سەر و نەپاراستنی لە دووڕوویی و نیفاقەوەیە، ئەوەش لاوازی ئیمانە، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (نیشانەی دووڕوو (منافق) سێ شتە: کە قسە ئەکا درۆ دەکات، کە بەڵێنی دا نایباتەسەر، ئەمانەت (سپاردە) ناپارێزێت). متفق عليه.

موسلیم ئەمەی بۆ زیاد کردووە لە ڕیوایەتی ئەم فەرموودەدا: (با نوێژ و ڕۆژوویش بکات و وانیشان بدات کە موسڵمانە).

خوای گەورەش تورە و خەمگینە لەم جۆرە کەسانە و دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣﴾ الصف: ٢ – ٣.

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێك ئەڵێن و ئەمجامی نادەن؟ بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە، گوناهێکی گەورە و هەڵەیەکی مەزنە لای خوا، ئەگەر شتێك بڵێن و ڕەفتاری پێ نەکەن، یا ڕەفتارەکەتان پێچەوانەی گوفتارتان بێت).

لەوانەیە هەندێك کەس بەجێنەهێنانی یا دواخستنی بەڵێنەکانیان لەبەر بەرژەوەندیەکانیان بێت، بەرژەوەندی خۆیان پێش بەرژەوەندی بەندەکان دەخەن، تەنانەت ئەگەر ئەو بەرژەوەندییەش شتێکی هیچ و پووچ و بێ نرخ بێت، وەك ئەوەی خوشکێك بەڵێن دەدا ئامادەبێت لە شوێنێك، بەڵام ناچێت یا دوای دەخات، تەنها لەبەرئەوەی تەماشای فیلمێك یا بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی دەکات و دەترسێت لە کیسی بچێت، چونکە خۆپەرستن و تەنها ئاسودەیی و بەرژەوەندی خۆیان دەوێ، گوێنادەنە هەستی خەڵکی. یاخود هەنێك هەن بێ باکن بە کاتی خەڵك و هیچ ڕێزێك و بەهایەك دانانێن بۆ کات، ماندووبوون، چاوەڕوانی، بێتاقەتی و تورەیی کەسانیتر، ئەمەش بە شەرعی خوا حەرامە، چونکە حەرامە لەسەر موسڵمان ئازاردانی موسڵمان، یان گاڵتەکردن بە هەستی و سوك تەماشاکردنی.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: (موسڵمانان برای یەکن، نە زوڵمی لێ دەکات، نە بێڕێزە پێی، نە سوك و ڕسوای دەکات و

نه دەیشکێنێت، سێ جار ئاماژەی بە سنگی کرد و فەرمووی خواپەرستی و لەخواترسی لێرەدایە، دواتر فەرمووی: لە کەسێکی خراپ هەژمار دەکرێت کەسێك براو خوشکەکەی خۆی سوك و بێ ڕێز تەماشا بکات، لەسەر موسڵمان حەرامە خوێن و ماڵ و ناموسی موسڵمانان) (رواه مسلم).

جا ئاگاداربە خوشکەکەم، ئەگەر بەڵێنت دا هیچ کات ئەو بەڵێنە مەشکێنە، بەجێی بێنە ئەگەرچی ماندوبوون و قوربانیدانیشی تێدابێت.

## ٧- خاکیبەو خۆبەزلزان مەبە:

خاکیبوون ڕەوشتی پێغەمبەرانە و دروشم و نیشانەی پیاوچاکانە، بزانە ئەوەی دەتباتە نێو دڵەکان و خۆشەویستت دەکات لای خەڵکی، خاکی بوونتە لەگەڵیان و بەسەریاندا خۆت بەگەورەتر نەزانی، هەندێك جار بە زەقی دەرینابڕن خۆبەزلزانن، بەڵکوو بەجۆری جیاواز دەیگەیەنن، وەك ئەوەی خۆبەزلزانین و خراپ مامەڵەکردنی بەڕێوەبەر لەگەڵ کارمەند و بەردەستەکانیدا، لەژێر ناوی بەرژەوەندی گشتی، یا بەو بیانووەی زەرورە بەڕێوبەر و کاربەدەست هەیبەتی هەبێت و کەس نەوێرێ لێی نزیك بێتەوە. یا قسە نەکردن لەگەڵ خەڵکیدا بەبیانووی خۆ هەڵنەقورتاندن لە کاروباری تایبەتیاندا.

هەرگیز خۆت بە گەورە مەزانە کاتێك خوشکەکانت ئامۆژگاریت دەکەن، بیربکەوە ئایا کاتێك خوای گەورە پێت دەڵێ بۆچی بەدەم فەرمانی منەوە نەهاتی، کاتێك لە زمانی فلانەوە بیستت؟ دەڵێی من

لەو باشتربووم و ئەو لە ئاستی ماددی و زانستی مندا نەبووە؟! ئەتوانی بڵێی: ئەو کێیە تا ئامۆژگاری من بکات؟! لەخوا بترسە و تەماشای وتەکە بکە و گوێی بۆ بگرە، نەك بوێژەکە، هەرگیز خۆت لە قسەی خێر و ئامۆژگاری چاکە لامەدە.

### ٨- ئامۆژگاری قبوڵ بکە:

(حەسەنی بەسری) زۆر هەڵمان دەنێ لەسەر قبوڵ کردنی ئامۆژگاری گوێگرتن لێی، تەنانەت دەیکاتە سێ بەشی ژیان: هیچ شتێکی بەسود نەماوەتەوە بۆ ژیان، سێ شت نەبێ:

١- برایەك لە هاونشێتی تووشی خێربێت، کاتێك لاربوویتەوە و لەڕێ لاتدا، بتهێنێتەوە سەر ڕێگاو ڕاستت بکاتەوە.

٢- بژێوییەکت هەبێ کە منەتی هیچ کەسی بەسەرەوە نەبێ، تا ناچار بیت بەهۆی ئەو بژێوییەوە شوێنی کەویت.

٣- نوێژێکی بەکۆمەڵ خاڵی لەهەڵە و پەڵە و پاداشتەکەی بەدەست بێنیت.

ئیمامی شافیعی (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: ئامۆژگاری کەسێکم کردبێت لێی وەرگرتبم چۆتە دڵمەوە و خۆشمویستووە.

هاوڕێیەك بگرە بتپارێزێت لە خراپە.

(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) (ڕەزای خوای لێبێت) بە (مزاحم)ی مەولای دەڵێ: (والی و فەرمانڕەواکان چاویان لەسەر خەڵك و کاربەدەستەکانیانە، منیش تۆ دەکەمە چاوی خۆم بەسەر

کاروکردەوەکانمەوە، ئەگەر گوێت لە قسەیەکم بوو، یا ڕەفتارێکم کە پێی لەکەدار دەبم ئامۆژگاریم بکە و مەهێڵە بیکەم).

ئەم پیاوە گەورانە بەو جۆرە حەزیان کردووە کەسانێتر ئامۆژگاریان بکات، لە هەڵە و کەموکورپییەکانیان ئاگاریان بکەنەوە، تۆیش ئامۆژگاری خوشکەکەت وەرگرە و گوێی بۆ ڕادێرەو هیچ دڵگران مەبە کاتێك بە ڕاشکاوی ڕاستییەکانیان پێ وتیت. ئەوەتا (مەیمونی کوڕی میهران) دێتە پێش چاوی هاوەڵەکانی و پێیان دەڵێ: (پێم بڵێن چ خراپە و ناحەزییەکم تێدایە، بەو جۆرە ئامۆژگاری دەکرێ کە ئەوەی بەدڵت نییە بیڵێی).

## ٩- بە حەیاو شەرمەوە بچۆ بەڕێوە:

ئایا باشتر لەوە هەیە کچ بەشەرم و حەیابێت؟! چونکە ئەم شەرمە ڕێگری دەکات هەمیشە لەوەی کارێك بە خراپە و هەڵەشەیی ئەمجام بدەیت و دواتر لێی پەشیمان بیت. ئایا ئەوە چ ڕێز و بەهایەکە کچێك قاقا پێبکەنێت، دەنگی خۆی باریك و سەرنجڕاکێش بکات، بەلەنجەولار بڕوات بەڕێوە و جلی بەد و ناقۆڵا لەبەربکات؟!

ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نافەرمووێت: ( عەیبە و خراپە و بێ حەیایی لە هەر شتێکدا بوو ئیلا سوکی دەکات، شەرم و حەیاش لە هەر شتێکدا بوو قورس و سەنگینی دەکات) ؟!.(إبن ماجة).

بەڵام نابێت ئەم شەرمە وات لێ بکات لاواز و زەبوون، یا گێل و سادە دەرکەویت. تەماشای چیرۆکی (موسا) (عليه السلام) و دوو

کچەکەی (شعیب) (علیه السلام)، بکە: ﴿قَالَ مَا خَطْبُكُمَا﴾ واتە: (لێی پرسین بۆچی لێرە وەستاون؟ کێشەتان چیە وا دوورەپەرێزن؟)، لەمە زیاتری نەوت. نە لەناوی پرسین نە ناونیشان، ئایا ئەوە هاوسەرگیرییان کردووە یان نا؟ وەك ئەوەی ئێستا یەکسەر لەوە دەپرسن. ئەمجا تەماشابکە بزانە وەڵامی دوو کچەکەی چی بوو؟ ئەوانیش کورت و پوخت لە ئاستی پرسیارەکەدا وەڵامی یان دایەوە ﴿لَا نَسْقِى حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ ۖ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾ قصص: ٢٣.

واتە: (دوو کچەکە وتیان: (ئێمە ناتوانین ماڵاتەکانمان ئاو بدەین هەتا شوانەکان نەڕۆن و چۆڵی نەکەن، باوکیشمان پیرەمێردێکی بەساڵاچووە). بەم جۆرە پەردەیان دا بەسەر قسەکردنەکەیاندا، ئیتر نە لە ناوی ئەم گەنجەیان پرسی، نە بڵێن هاوسەردارە یان نا و... هتد.

هەر بەم شێوەیە کاتێکیش یەکێك لە کچەکان هاتەوە و وتی: ﴿إِنَّ أَبِى يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾ قصص: ٢٥. واتە: (باوکم بانگت دەکات، دەیەوێت پاداشتی ئەو چاکە و ئاودانی ماڵاتەکەمانت باتەوە کە بۆ ئێمەت ئەمجامدا).

ئەم ئافرەتە ئەوەندە بە گەورەیی و حەیا بەرزییەوە دەچوو بەرێوە، کاتێك لەگەڵ ئەم گەنجە (موسا) دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، قورئانی پیرۆز وەسفی ڕێ و ڕۆشتنەکەی دەکات و دەفەرمووێ: ﴿فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِى عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ﴾ واتە: (دوای تاوێك یەکێك لە کچەکان گەڕایەوە و هات بۆلای موسا، زۆر بە شەرم و حەیاوە دەڕۆیشت بەڕێگادا).

ئەمەیە شەرم و حەیا، ئەمەیە قسەکردن و وەڵامدانەوە. نەك پرسین لە ناو و شوێن و ژیانی تایبەت و ئەوەندە گفتوگۆ بکەن قسەکەیان درێژە بکێشێت بۆ بابەتێکی تر.

## ١٠- هاوڕێ و دەستە خوشکە چاکەکانت خۆش بوێت:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (هەر دوو برا یان دوو خوشك یەکیان خۆش بوێت لەبەر خوا خواش خۆشی دەوێن، کامیان خۆشەویستی بۆ ئەویتر زیاتربوو ئەوا لای خوا خۆشەویسترە) إبن حبان و حاکم.

ئیمامی شافیعی چەندە جوان دەڵێ:

أُحِبُ الصالحين ولستُ منهم    لعلى أن أنال بهم شفاعةً

وأكره مَنْ بَضاعتهُ المعاصى    وإن كُنّا سواءً في البضاعةِ.

واتە: ( پیاوچاکانم خۆش دەوێ هەرچەندە لەوانیش نیم، سا بەڵکوو لەوانەوە شەفاعەتێکم دەست کەوێت، ڕقم لەوانەیە کۆڵ و باریان پڕ لە تاوانە، با وەك یەکیش بین لە کۆڵ و بارماندا).

ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خۆشەویست وەبیربێنەرەوە کە دەفەرمووێ: (نزای موسڵمان بۆ موسڵمان لەپاشەملە گیرایە لای خوای گەورە، لە ڕاسەری فریشتەیەك دانراوە، هەر کە نزایەك بۆ براکەی (یا خوشکەکەی) دەکات فریشتەکە دەڵێ: ئامین بۆ تۆیش هەروەها). رواه مسلم.

بەڵێ، ئەمە بەهرەو نیعمەتی خوشکایەتی و برایەتییە لەپێناوی خوادا، کە ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بە نرخترین شت دایدەنێت دوای ئیسلام و دەفەرموێت: (لەدوای ئیسلامەتی هیچ شتێک ئەوەندەی هاوەڵی چاک باشتر نییە، ئەگەر هەر کات خۆشەویستی برایەتیتان بینی دەستی پێوەبگرن (لە دەستی مەدەن)).

لە خۆشییەکانی دونیا هیچ نەماوە سێ شت نەبێ کە دڵ پێی بکرێتەوە و ئارامت بکاتەوە:

١- بەیەک گەشتن و چاوکەوتن بە براکانت.

٢- خەریکبوون بە قورئانەوە.

٣- ماڵێک ئەهلەکەی بەزیکر و یادی خودا زمانیان پڕابێت و هەمیشە پاراو بێت بە زیکری خوا.

## ١١- لە هەڵەی خوشکە موسڵمانەکەت خۆشبە:

بۆچی ئەم دەنگ وەرگرتن و گرژی و مۆنییە لەنێو خوشکایەتیدا؟ بۆچی سەرزەنشت و شەڕ و سەنگەر لەیەک گرتن و مرومۆچی؟ نەتبیستووە پیاوچاکان چۆن لەگەڵ یەک ڕەفتاریان کردووە، (ئیبن سەماک) یەکێ لە هاوڕێکانی دەمەقاڵێی لەگەڵ دەکات و پێی دەڵێ: ئیبن سەماک بەیانی من و تۆیان گوتووە، بزانە چۆن لۆمەت دەکەم.

ئیبن سەماک پێی وت: نا، بەڵکوو بەیانی من و تۆیان وتووە کە لەیەک خۆشدەبین!.

ئایا باشتر نییە لەبری لۆمە و سەرزەنشت و دەنگ وەرگرتن ئامۆژگاری چاکەی خوشکەکەت بکەیت و هەر هەڵەیەکی بەرامبەرت کرد لێی خۆش بیت و لە کەم و کورِییەکانی ببووریت؟

ئایا لێبوردن لە یەکتری پاکتر و ئارام کەرەوە نییە بۆ دڵ؟ چی لەوە جوانترە دەست بخەیتە دەستی خوشکەکەت و بڵێی: خوایە لەمن و لەم خوشکەشم خۆش بە. دڵت بەرامبەری لە هەموو خەوشێك پاك بکەیتەوە، بزانە دووبەرەکی و ئاژاوە و قسەی ناخۆش بەرامبەر یەکدی ئاوێکی لێڵە، فیتنە هەر کات بیەوێت ڕاوی تێدا دەکات، چی لەوە باشترە هەمیشە ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لەبەر چاوبگرین و لە ڕەفتارماندا بەرجەستەی بکەین: (لە وەسفی ئیمانداراندا دەفەرمووێ: ( ڕق و قین و دووبەرەکی لەنێوانیاندا نییە و دڵەکانیان یەك دڵە ). بخاری و مسلم.

ئەوەش بە پێچەوانەی بێباوەڕەوە کە دڵەکانیان پەرتەوازەیە لەیەك و نابێت مرۆڤی باوەڕدار وەهابێ.

## ١٢- هەرگیز ئاوات بە بەڵاو ناڕەحەتی مەخوازە:

هەمیشە ئەو فەرموودەیەی خۆشەویستت لەیادبێت کە دەفەرمووێت: (هەمیشە ژن و پیاوی ئیماندار لەبەردەم بەڵا و تاقیکردنەوەدان، لە جەستەیدا، لە ماڵ و سامان و منداڵیدا هەتا ئەو کاتەی دەگات بەخوای خۆی و هیچ هەڵەیەکی لەسەر نییە). بخاري و مسلم.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەهی لێکردووین لەوەی تەمەننای بەلا بکەین، وەك دەفەرمووێ: (هەرگیز تەمەننای ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن مەکەن، داوای لەشساغی و سەلامەتی لەخوا بکەن، ئەگەریش ڕووبەڕووبونەوە ئارام بگرن). رواه البخاري ومسلم.

(خوای گەورە هیچ بەخششێکی نەداوە بە بەندەکانی باشتر و بەفەرتر لە ئارامگرتن)

## ١٣- بەخشندە و دەست و دڵ فراوان بە:

بەخشندەیی، مەبەست لێی تەنها بەخشینی شتی زۆر نییە، بەڵکوو دەتوانی هەرچەندە کەمیش بێت ببەخشیت و دەست و دڵ فراوان بیت لە هەموو شتێکدا، بۆیە سیفەتێکی جوانە هەموو کەس دەتوانێ هەیبێت، نەك تەنها دەوڵەمەند و سەر و سامانداره‌کان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (ئەی ژنانی موسڵمان، ڕژدی و ڕەزیلی مەکە بەرامبەر دراوسێکەت، گەر بە (فرسن شاە). ئەو پارچە گۆشتە بچوکەیە بەژێر پێی مەڕ و بەرانەوەیە). متفق عليه.

ئەمە هاندانی پێغەمبەرە بۆ بەخشندەیی لە هەر ئاستێکدا بێت، بەشتی کەم و کەم نرخیش بێت دەتوانیت دەست و دڵ فراوان بیت. ئەگەر بەشۆربایەکیش بێت، نەك وابزانیت بەس بە سفرەی ڕازاوە و دوور و درێژ دەتوانی ببیتە کەسێکی خاوەن کەرەم، بەڵام گرنگ ئەوەیە مەبەست و نیەتت ڕەزامەندی خوابێت تاکوو پاداشتەکەی لە دەست نەدەیت.

## ١٤- ڕووخۆش بە:

بێگومان لەگەڵ خوشکەکانتدا ـ ئاگاداربە لەگەڵ پیاوانی نامەحرەم نا ـ تا گومانی خراپت پێ نەبەن و دڵ نەخۆشەکان زەفەرت پێ نەبەن. خوای پەروەردگار ئاگادارمان دەکاتەوە لەمە و دەفەرمووێت: ﴿ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾ الأحزاب: ٣٢.

واتە: (قسە بەناسکی و شێوەیەك مەکەن، نەوەك ئەوەی دڵی نەخۆشە بووروژێت و نیازی خراپ ببات، هەمیشە و بەردەوام قسەی چاك و بەجێ بکەن).

ڕووخۆشی و کراوەیی سیفەتێکە کە پێویستە هەموو ئافرەتێکی موسڵمان و پیاوێکی موسڵمان خۆیان پێ بڕازێننەوە، ڕووی گەش زوو دەچێتە نێو دڵەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: (لەکاری چاکە ڕژدی و ڕەزیلی مەکە، تەنانەت ئەگەر ڕووی خۆشیش بێت بەرامبەر براکەت). رواه مسلم. واتە: ڕووی خۆشی بە کاری چاکە داناوە.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: (خەندەیەکت بەڕووی براکەت (یا خوشکەکەت) سەدەقەیە). الترمذي.

بە خەندەوە و بەڕووی خۆشەوە چوون بەدەم خەڵکییەوە دووڕووی (نیفاق) نییە، بەڵکوو زەرورەتێکی کۆمەڵایەتییە بۆ وابەستەبوونی دڵەکان بەیەکەوە و چاندنی خۆشەویستی بەرامبەر یەك.

لەوانەیە ئەو فەرموودەیەی (خاتوو عائیشە) (سەلامی خوای لێبێت) بیستبێت کە دەگێڕێتەوە: پیاوێك مۆڵەتی لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەرگرت بێتە خزمەتی، فەرمووی: ( ئیزنی بدەن با بێت با بێتە ژوورەوە برا یا کوڕێکی خراپی هۆزەکە)، کاتێك هاتە ژوورەوە بە نەرمی قسەی لەگەڵ کرد و ڕووی خۆش بوو لەگەڵی، خاتوو عائیشە دەڵی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا پێشتر وات پێوت و دوایش کە هات قسەی نەرمت لەگەڵ کرد؟! فەرمووی (خراپترینی خەڵك ئەوەیە وازیان لێ بێنی تا لە زمان خراپیان پارێزراوبیت). رواه البخاری.

**لەکۆتایی ئەم بەشەدا دەڵێم:**

- ❖ بەپێی تەمەنی خۆت هەڵسوکەوت بکە، وادەرمەکەوە کە ئافرەتێکی بەتەمەنی هاوسەرداریت، پێست و دەموچاوت مەخەرە بەر ماکیاج و شتومەکی جوانکاری و خەساری بکەیت.
- ❖ جلوبەرگی داپۆشراو و شەرعی بپۆشە کە گونجاو بێت لەگەڵ تەمەنت.
- ❖ پەلەمەکە لە ڕۆشتنی زەمەن، بهێڵە کات خۆی بڕوات و پێشی مەکەوە، ڕۆژەکانی ژیانت سات بە سات بژی و کەڵکی لێوەرگرە.
- ❖ سود لە ئەزموونی کەسانیتر وەرگرە.
- ❖ کار بە ئامۆژگاری دایك و باوکت و ئەهلی دین وعلیم بکە.
- ❖ دڵنیابە هاوبەشی ژیانت ڕۆژێك دێت و لە دەرگات دەدات و بە ئیزنی خوا، هیچ کچێك نییە بێ داواکار بووبێت، تەنانەت ئەوانەشی

شەمەندەفەری هاوسەرگیری جێی هێشتوون، ئەوانە لەوانەیە خۆیان یا خێزانیان ڕەفزی زۆر کەسیان کردبێت و بەدڵ و خواستی خۆیان نەبووە، بۆیە ماونەتەوە نەك لەبەر بێ داواکاری بووبێ، لەوانەیە مەرجیان بۆ هاوسەرگیری قورس بووبێت.



# وەرزی چوارەم تۆ و ڕۆشنبیرییەکەت

## ١- بیرت لە داهاتووی خوێندنەکەت بکەوە:

بیرت لای خوێندنەکەت بێت، هەمیشە پلان دانێ بۆ داهاتووت، ئامانجت دیاری بکە کە دەتەوێت ببی بەچی لە داهاتوودا (بە ئیزنی خوا).

ڕۆژەکانت زایە مەکە بە مانەوە لە خوێندن و گۆڕینی بەش، سەرلەنوێ دەستپێکردن لە بەشێکیتر و ساڵێکیتر بەبیانووی کات کوشتن نەبوونی فەراغ.

ئەوەی وا بیربکەیتەوە هەمیشە پیاوێك هەیە دەستەبەری ژیانت دەکات، ئایا باوك بێت یا برا یا هاوسەر، گومانی تێدا نییە ئافرەت لە ئیسلامدا ڕێزلێگیراوە، فەرزکراوە لەسەر پیاو بەخێوی بکات و بژێوی دەستەبەربکات، وەك سۆز و میهرەبانییەك بۆی. هەروەها پاراستنی مێیینەتی لە ڕووبەڕووبونەوەی خراپە و مەترسییەکان، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ئیتر ئافرەت بۆی نەبێت بخوێنێت و هەوڵبدات بۆ ئایندەی، ئەگەر وابێت ئەی کێ هەستێت بە وانە وتنەوە لە خوێندنگا بە کچەکانمان؟! کێ چارەسەریان بکات لە نەخۆشخانەکان؟ کێ دەستییان بگرێ و بیانخاتە سەر ڕێگای ڕاست و سەرکەوتن؟

تۆ دەزانیت خەرجی ژیان قورس و گرانە، نازانی ڕۆژگار چی بۆ حەشاردراوی، کەواتە بەچەکی زانست و زانین خۆت پڕ چەك بکە، ئاستی تێگەیشتن و دەرکت بۆ ژیان بەرزبکەوە، کاتە بەتاڵەکانت بەکاری باش و شتی بەسود بەسەربەرە.

تۆ بەرپرسیت لەسەر بەدەستهێنانی زانست و زانیاری، چونکە فەرزە لەسەر هەموو ئافرەت و پیاوێکی موسڵمان، پێویستە لەو زانستەش شتێك بەدەست بهێنی کە سودی بۆ خۆت و کۆمەڵگەکەت و کچانی هاوڕەگەزت هەبێت، ئەو زانستە بکەیتە چەکێکی بەسود و بەرگری پێ بکەی.

ئایا دروستە قوتابی هیچ هەوڵ نەدا و کۆشش نەکا، شەو و ڕۆژ سەرقاڵی ئەم کەناڵ و ئەو کەناڵ بۆ تەماشای بەرنامە و (فیلم)ی بێ سود، یا بە مۆبایل قسەکردن لەگەڵ هاوڕێ و ئەمجا بڵێی: خوایە دەرچم و خوایە سەرکەوتووم بکەیت؟!

ئەم کۆشش و وانە خوێندنە عیبادەتە و خوا و پێغەمبەری خوا هانمان دەدەن بۆی، کەواتە شایەنیەتی بەدەم ئەم عیبادەتەوە بڕۆین بە هەوڵ و خۆماندووکردن و تێکۆشان، بیرت نەچێ چەندین کەس لە خێزان و دەوروبەرت چاوەڕێی سەرکەوتنی تۆن، تا خەندە بخەیتە سەر دەموچاویان و دڵیان خۆش بکەیت.

***

## ٢- ڕۆشنبیری گشتیت فراوان بکە:

ئەم پڕۆگرامی خوێندنەی هەیە و دەیخوێنیت، تەنها لە چەند بوارێکی تایبەتدا زانیاریت زیاد دەکات. کەواتە پێویستە لەپاڵ ئەوەدا زانیاری و ڕۆشنبیری گشتیت هەبێت و شارەزابی لە جیهانی دەوروبەرت. بۆ ئەم مەبەستە کتێبی بەسود بخوێنەرەوە، کتێبخانەکان پڕن لەو کتێبانەی مەلۆیەك بخەنە سەر خەرمانی زانیارییەکانت، کاتەکانت زایە مەکە بە خوێندنەوەی سایت و گۆڤار و کتێبی ئاست نزم و بێ نرخ، کە هەموو غەمێکیان باسکردنی ئەم ئەکتەر و ئەو گۆرانیبێژ و خۆڕازاندنەوە و.... هتد.

تەماشای بەرنامەیەك بکە سودی بۆ خۆت و دەوروبەرت هەبێت لە ئێستا و داهاتوودا. هەوڵبدە ئەو بابەتانەی دەیخوێنیتەوە یا دەبیستی، بینووسیتەوە تا لەمێشکتدا بمێنێتەوە، باسی بکە بۆ هاوڕێکانت و کەسانیتر، ئەوە وات لێ ئەکات هەم بابەتەکەت لەبیرنەچێتەوە، هەمیش وات لێ دەکات باوەڕت بەخۆت هەبێت و سودێکیش بە دەوروبەرت دەگەیەنیت، فێرت دەکات کە توانای بەخشینت هەبێت. هیچ زانیارییەك بە کەم مەزانەو هەوڵبدە فەرموودە لەبەربکەیت، وەك: (الأربعین النوویة) و قورئانی پیرۆز، کاتێك قسە دەکەیت ئایەتێك یا فەرموودەیەك بەبەڵگە بهێنەرەوە، بەمە توانای قسەکردنت زیاد دەبێ قەینا دووبارەش بن.

### ٣- کاتەکانت ڕێکبخە:

بزانە چۆن کاتەکانت ڕێک دەخەیت لەنێوان خوێندن و ئەرکەکانی ماڵەوە؟

کاتێك مێشك ماندو و ئاڵۆزە، ماڵ قەرەباڵغ و پڕ لە دەنگەدەنگە، کەواتە لە کەشێکی وەهادا خوێندنەوە و نووسین گونجاو نییە، لێرەدا هەلێکە بۆئەوەی هەستی بە ئەرکەکانی ماڵەوە، تا ئەو کاتەی کەشێکی ئارام دروست دەبێت و مناڵەکان خەوتوون، یا لە دەرەوەن.



# وەرزی پێنجەم

## تۆ و حیجاب (باڵاپۆشی)

بۆچی نابینم حیجاب بووبێتە تاجێك بەسەرتەوە؟ بۆچی گەوهەرێکی پارێزراو و لەناو بەرگی باڵاپۆشیدا نابینم؟ بزانە و دڵنیابە باڵاپۆشی نەدواکەوتنە نە گەڕانەوەیە بەرەو دواوە، بەڵکوو پاکێتی و بەختەوەری و ئاسودەیی هەمیشەییە.

ئایا جیاوازی نێوان کچێکی ڕووت و کچێکی داپۆشراو نابینی؟ دە تو خوا بڵێ کامیان باشترە؟ کچێك کە بە بەرگی ئیمان خۆی داپۆشیبێت و جلوبەرگی ڕێز و شەرەفی لەبەرکردبێت، یان ڕووتێك کە بەرگی حەیا و شەرەفی لەخۆی داماڵی بێت، بەرگی باوەڕی لەخۆی کردبێتەوە، وەکوو نەسرانی و یەهودی و ناموسڵمان و هیچ جیاوازییەکی نەبێ لەگەڵیان؟!

مامۆستا عەباس مەحمود عەقاد دەڵێت: " باڵاپۆشی ئافرەتی موسڵمان مانای زیندانی نییە، بەڵکوو ڕێگرە لە سەرگەردانی، کەواتە لە ئیسلامدا شتێك نییە کە بە مانای کۆت و بەند و دژی ئازادی بێ، هیچ ڕێگری ناکات لەبەردەم ئازادی ئافرەت و سود و بەرژەوەندییەکانی".

کەواتە باڵاپۆشی ڕێگرە لە سەرلێشێواوی و گومڕایی و خۆدەرخستن، پارێزەری حەرامەکانە کە تێی نەکەویت، پاراستنی پاکداوێن و شەرم و حەیایە لە کۆمەڵگەدا.

## ١- گفتوگۆ لەگەڵ بێ حیجابێکدا:

- ئایا حەز دەکەیت بە دەرخستنی هەر تاڵە موویەك (کە نامەحرەم بیبینێ)، خراپەیەکت بۆ بنووسرێت؟
- دە دڵنیابە هەرچوونە دەرەوەیەکت بەسفوری، بەقەد ئەو کەسانەی دەتبینن خراپە وەردەگری، ئایا چاکەکانت ئەوەندەیە هاوتابێ یا زیاتر بێت لەم هەموو خراپەیە؟!
- ئایا ئەتوانیت بە زوبان بڵێی: نا بۆ فەرمانی خوای گەورە، لەوەی هەر کات کە بێ حیجاب دەردەکەویت؟!باوەڕ ناکەم بە ئەنقەست بتوانیت ئەوە بڵێیت، بەڵام بە حیجاب نەکردنت ئەوە دەڵێیت؟
- ئایا ناتەوێت لە بەهەشتدا لە (حور العین)ەکان جوانتر و ڕێزدارتر بیت؟ دەی خوشکانی ئیماندار پێگەتان لەوان بەرزترە، چونکە (حور العین) هەر گوێڕایەڵ و فەرمانبەردار دروستکراون، بەڵام تۆ بە ئارام گرتن لەسەر فەرمانی خوا و گوێڕایەڵی کردنی و خۆلادان لە خراپە و تاوان بەدەستی دێنی.
- وا دەزانیت (ملك الموت) فریشتەی گیان کێشان، دەوەستێت بەسەرتەوە تا تۆ حیجاب دەکەیت و تۆبە دەکەیت ئەمجا گیانت دەکێشێ!
- ئایا دەتەوێت لە دەستەی (الفجار) بیت، کە خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت ﴿وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ١٤﴾ الإنفطار: ١٤.

واتە: (تاوانکار و لەفەرمان دەرچووەکان لەناو دۆزەخدا ژیانی پڕ ئێش و ئازار بەسەردەبەن).

دەی شەرم و حەیا دژەکەی (الفجور) تاوان و خراپەکارییە. واتە بە ئاشکرا تاوانکردن و نەترسان لە خەشمی خوا، ئەی بێ حیجابیش بە ئاشکرا تاوانکردن نییە؟! بزانە بەهەشت موڵکی خوای گەورەیە (ئەو خوایەی تۆ بە بێ حیجابییەکەت نافەرمانی دەکەیت)، بەهەشت ڕێگاکەی بەسەختی و ناڕەحەتییەکان چێنراوە دۆزەخیش بەئارەزووەکان، وا گومان مەبە ڕێگای گەیشتن بەرەو خوای پەروەردگار ئاسان و ئامادەکراو و بێ دەردەسەربێت، بەڵام پاڵەوانی ڕاستەقینە ئەوەیە هەموو بەربەستەکان ببڕێت تا دەگات پێی..

ئەمجا زوبانی حاڵت دەڵێت: ﴿وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ﴾ طه: ٨٤. واتە: (بەپەلە هاتم ئەی پەروەردگار تا تۆ لێم ڕازی بیت)، لەو چاکەکارانە بە کە خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَـٰمُهُۥ مِسْكٌ وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَـٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾﴾ المطففين: ٢٢ — ٢٦.

***

## ٢- گومانەکان لەبارەی حیجابەوە

أ- هەندێك كەس دەڵێن: پاکی ئافرەت بەو پارچە قوماشە نییە سەر و جەستەی پێ داپۆشێت، چەندەها ئافرەت هەن خۆیان داپۆشیوە بە ڕووالەت، بەڵام لە ڕەفتاردا بەدکارن، چەندەهاش هەن ڕووتن و پۆشتە نین و هیچ خراپەیەکیشیان لێ ناوەشێتەوە؟.

وەڵام: ئەمە ڕاستە، چونکە تەنها جلوبەرگ نییە پاکی و خۆڕاگرییەکی نەبووت پێ ببەخشێ، بەڵام کێ وتوویەتی خوای گەورە باڵاپۆشی بۆ پاکێتی و پاکیزەیی ئافرەت بە شەرعی کردووە؟! کێ باسی ئەوەی کردووە کە بڵێن حیجاب جاڕدانە لەوەی ئەوەی نەیکات بەدکارە؟!

پەروەردگار حیجابی فەرز کردووە لەسەر ئافرەت بۆ پاراستنی کۆمەڵگە و پاك داوێنی پیاوان، ئەو پیاوانەی چاویان لەسەریەتی، نەك ئەو چاوانەی تەنها خۆی دەیانبینێت.

ب- یاخود هەندێکیتر دەڵێن: حیجاب شاردنەوەی خراپەکاری و شاردنەوەی کەسێتی ئاسان دەکات، واتە هەندێك بۆیە دەیپۆشن تاوەکوو بەدکاری و تاوانەکانیانی لەژێردا پەردەپۆش بکەن!

وەڵام: ئافرەت کە خۆی دادەپۆشێت ڕووبەڕووی زۆر تەنگ و چەڵەمە و کێشە دەبێتەوە، بەتایبەت لەم سەردەمەدا هەر لە هێرشی ڕاگەیاندنەکان تا بەڕێوەبەرێتی فەرمانگە و زانکۆ و قوتابخانەکان، لە

هەموو شوێنێك لەلایەن کەسانی نەفام و نەفس نزمەوە دەکەوێتە بەر تانە و تەشەر.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئافرەت لەبەر ڕەزامەندی خوا ئارام دەگرن و خۆڕاگرن، ئەمەش لە کەسێك ناوەشێتەوە باوەڕدار نەبێ و دەبێ ئیمانێکی ڕاستەقینەی هەبێت کە قورئان پەروەردەی کردبێت، ئایا تاوانی ئافرەتێکی پاکی باڵاپۆش چییە، کەسێکی بەدکار و درۆزنی بێباك لەبەرچاوی خەڵکیدا بە باڵاپۆش کردنی خۆی دروشمی پاکیزەیی هەڵدەدا؟

ئایا ئەگەر پیاوێك بەجلی سەربازییەوە خراپەی کرد، ئایا دەڵێین هەرچی جل و نیشانەی سەربازییە لابرێت و سڵ بکەینەوە لە هەمووی، لە ترسی ئەوەی یەك کەس بە خراپ بەکاری هێناوە؟!.

ت- یاخود دەڵێن: وزەی سێکسی لە مرۆڤدا زۆرە و مەترسیدارە، حیجابیش جوانییەکانی ئافرەت دادەپۆشێت و دواتر گەنجەکان لەژێر سەرکوتکردنی سێکسیدا دەمێننەوە، دواتر لە شێوەی دەست درێژی و لاقەکردن ئەو سێکسە پەنگ خواردووەی دەردەبڕێت، چارەسەریش بۆ ئەمە ئازادی ئافرەت و نەمانی پۆشتەییە، تا گەنجەکان لەو پەنگخواردووییە ڕزگاریان بێت.

وەڵام: ئەگەر ئەم قسەیە ڕاست بێت، کەواتە دەبێت لە ئەمریکا و ئەوروپا کەمترین لاقەکردن و دەستدرێژی سێکسی ڕووبدات، کە ڕووتی و بەڕەڵایی لە لوتکەدایە، ئایا ئەمە ئەو ڕووداوانەی کەم کردۆتەوە؟!

ئایا لەوێ ئافرەت پارێزراوە لەو مەترسیانە؟! بێگومان نەخێر، ئەوەتا تازەترین ئامار دەری دەخات، لە هەر (٩٠) چرکەدا لە ئەمریکا تاوانێکی دەستدرێژی (سێکسی بەزۆر) ڕوودەدات، لە فەڕەنسا زیاتر لە (٢٥٠٠٠) بیست و پێنج هەزار ئافرەت سالآنە دەستدرێژی دەکرێتە سەریان.

ڕاپۆرتی ڕێکخراوی لێبوردەیی نێودەوڵەتی، کە ساڵی (٢٠٠٤) دەرچووە دەڵێت: لە هەر پێنج ئافرەت یەکێکیان ڕووبەڕووی دەستدرێژی سێکسی بەزۆر دەبنەوە لە جیهاندا.

ج- هەندێکیتر دەڵێن، بالآپۆشی نیوەی کۆمەڵگە لەکاردەخات!

لە ڕاستیدا هیچ بەربەستێك نییە بۆ ئافرەتی بالآپۆش تا هەستێت بەکارەکانی، هەر کارێك ڕێی پێدراوە دەتوانێت ئەنجامی بدات، هیچ کات خۆداپۆشین نەبووەتە ڕێگر لە بەدەستهێنانی زانست و خوێندندا، بزانە زۆربەی قوتابییە سەرکەوتووەکان بالآپۆشن، ئەو قوتابییانەی بەهۆی بالآپۆشییەوە دوورن لە خۆڕازاندنەوە و تێکەڵی و کات بەسەربردنی ناشەرعی، لەتاقیکردنەوەکاندا پلەی بەرز بەدەست دێنن و جێی ڕێز و شانازین بۆ مامۆستا و خوێندنگە و کۆمەڵگەکەیان.

د- زۆرجار دەوترێت کە ڕووتی و نەپۆشتەیی هیچ کات سەرنجی پیاوان ڕاناکێشێت، ئەوەندەی ئافرەتی پۆشتە ڕایدەکێشێت، چونکە خۆی شاردۆتەوە پیاوان زیاتر لێی وورد دەبنەوە تا بیبینن و بیناسن.

وەڵام: ئەگەر ناپۆشتەیی شتێکی ئاسایی بێ و سەرنجڕاکێش نەبێت، ئەی بۆچی خۆت ڕووت دەکەیتەوە؟ بۆ کێ خۆت دەڕازێنیتەوە؟! ئەی بۆچی ئەو ئەرکە زۆرەی خەرجی شوێنکەوتنی مۆدە و ماکیاج و خۆجوانکردن دەخەیتە سەرشانت؟! بێگومان زۆرترین ڕێژەی بێ ڕەوشتی و لادانی سێکسی و تێکەڵی (وەچە)، هاوکاتە لەگەڵ چوونە دەرەوەی ئافرەت بەڕووتی، زۆرترین نەخۆشی سێکسی لەو وڵاتانەدان کە بەناو ئازادییە و ژنی لەبێ ڕەوشتی و بەرەڵاییدایە، بەڵام چاوەکان تەنها لەسەر ئافرەتە داپۆشراوەکانە، چونکە نموونەی ئافرەتی داپۆشراو وەکوو کتێبێکی داخراوە، نازانن چی لەناو ئاخنیدایە، چەندە تەماشای بەرگەکەی بکەیت نازانی چییە و لەناوەڕۆکەکەی تێ ناگەیت؟ بەڵام ئافرەتی ڕووت یا دانەپۆشراو وەکوو کتێبێکی کراوە وایە، هەموو دەستێك پێی دەگات و بێ سڵ کردنەوە پەڕەکانی هەڵ دەدەنەوە و ئەم دیو دیوی دەکەن، کاتێك ڕەونەقی نەماو ڕەنگ و ڕووی لەدەستدا و لاپەڕەکانی دڕا وازی لێ دێنن، ئیتر ئەو کاتە دەبێتە کتێبێکی کۆنی شڕ، تەنانەت لە کتێبخانەیماڵیشەوە دەیخەنە پشتەوە و حەزناکەن دەرکەوێت، ئیتر چ بگات بە کتێبخانە گەورە و گشتییەکان.



## ٣- پرسیارەکان لەسەر حیجاب (بالآپۆشی)

**أ- دەبێتە بەربەست لە بەردەم جوڵە و پێشکەوتن؟!** بزانە دایکانی ئیماندار و ئافرەتە هاوەڵە بەڕێزەکان، بەتەواوی ئازادی و لەسنوری شەرعدا جموجوڵ و چالاکییان هەبووە، هەر لە بەشداری شەڕەوە هەتا چالاکی کۆمەڵایەتی بێ ئەوەی حیجاب ببێتە ڕێگر و بەربەست بۆیان، کەواتە کێشە لە پۆشتەییەکەدا نیە، تەماشای خوشکە بالآپۆشەکانت بکە هەر لە پزیشك و مامۆستا و ئەندازیار و... هتد. چۆن بێ هیچ کێشەیەك و سەرکەوتووانە ژیانی ڕۆژانەیان بەڕێ دەکەن.

**ب- دەترسم جوانی شیك پۆشیم لەدەست بدەم:**

وامەزانە ئیسلام بە شڕپۆشی و ڕوواڵەت خراپەوە تۆی دەوێت، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پاك و خاوێن بووە و داوادەکات کە پاك و خاوێن و پۆشتەبین.

تەماشاکە (فابیان) نمایشکاری بەناوبانگی فەڕەنسی لەوپەڕی ئازادی و شۆڕەتدا، کاتێك خوا هیدایەتی دەدات و موسڵمان دەبێت چی دەڵێ: (ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوای گەورە نەبوایە ژیانم لە دەست دەدا، لەو جیهانەی مرۆڤ ئەوەندە خۆی دێنێتە خوارەوە تا دەبێتە ئاژەڵ، هەموو غەمێکی تێرکردنی ئارەزووەکانیەتی بێ هیچ بەهاو بنەمایەك). ئەمە لە کاتێکدایە گرانبەهاترین جلوبەرگی لەبەردابووە، کە زۆرێك لە کچان خەونی پێوە دەبینن و خولیای ئەو پلە و کارەی

ئەوبوون، بەڵام تێگەیشت ئەمانە هەمووی سەرابێکی درۆ و هەڵخەڵەتێنەرن.

ت- هێشتا تەمەنم منالە بۆ پۆشتەیی:

دەبێ بزانیت لاو و گەنجەکان زیاتر پێویستییان بە خۆپۆشینە، ناکرێ تۆش لەوانەبیت کەوا دەزانن گەنج هەموو شتێك بکات و بەپێی ئارەزووی جل بپۆشێت، تا خۆشی بە گەنجێتی خۆیەوە بکات و بڵێ بالاپۆشی تەنها بۆ ئافرەتە بەتەمەنەکانە! وردبەرەوە لە تۆماری مردووەکان چەندە گەنجی تیایە کە لە هەرەتی گەنجیدا لە پڕ ژیانیان وەستاوەو وایانزانیوە فریشتەی گیان کێشان تەنها بۆ سەر پیر و پەککەوتەکان دەچێت.

هەر ڕۆژێك دەڕوات هەنگاوێك لە قیامەت نزیك دەکەوێتەوە و لەدونیا دوور! ئەی چیت ئامادەکردووە بۆ دوای مردن؟! جا تا زووە سواری شەمەندەفەری تۆبە و پەشیمانی و گەڕانەوە بۆلای خوا ببە، تا وێستگەکەی جێنەهێشتووە. وا بیربکەوە لەڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوەکە سبەینییە.

پ- کەشوهەوا گەرمە، چۆن خۆم داپۆشم:

ئەگەر وڵاتەکەت لە وڵاتە گەرمەسێرەکانە، ئایا دەزانیت کەشوهەوای دەوروبەری نیوە دورگەی عەرەبی چۆن بووە؟ بێ ئەوەی هیچ فێنکەرەوەیەکیان هەبێت، ئایا موسڵمانانی ئەو سەردەمە لەبەر ئەم بیانوو و بەهانەیە خۆیان دانەپۆشیوە و بێ فەرمانی خوایان کردووە؟ نەخێر، بەڵکوو ئەوان ملکەچی فەرمانی خوابوون و بە

خۆشەویستی و بیروباوەڕی پتەوەوە، بزانە چەندە لەم دونیایەدا گەرم بێت ناگاتە پریشکێکی دۆزەخ، کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قُل نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا﴾ توبة: ٨١. واتە: (پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ بەتینتر و گەرمترە ئەگەر تێبگەن و بیروهۆشیان بخەنەکار).

پ- هەر کاتێك گەنجێکی گونجاو هاتە خوازبێنیم حیجاب دەپۆشم:

ئایا ئەم گەنجە گونجاوە بە بڕوای تۆ کێیە؟!

ئایا ئەوەیە ڕازی بیت خەڵکی عەورەتی هاوسەرەکەی ببینن؟ کێ دێتە خوازبێنیت کە ڕازی بێت بەوەی تۆ ڕووت بیت؟ ئەوەی بەوە ڕازی بێت، چۆن دوای هاوسەرگیری دەهێڵێت تۆ خۆت دابپۆشی؟

دەی ئایا ڕەزامەندی ئەو دەخەیتە پێش ڕەزامەندی پەروەردگارت؟! ئایا بەهەشت دەفرۆشی بە گەنجێك کە ئیتاعەی خوا ناکات، بەڵام ئەگەر گەنجێك تۆی بە پۆشتەیی بوێت و بەوەوە بتخوازێت، دواییش ناتوانێت ڕێت لێ بگرێت. بیربکەرەوە ئایا ئەگەر ژیان لەسەر بێ فەرمانی خوا بونیات بنێیت، ئەو هاوسەرگیرییە سەرکەوتوو دەبێت؟! ئەگەریش بە ڕواڵەت و دونیایی سەرکەوتووبیت، ڕازیت بە تورەیی و خەشمی خوا؟!

بزانە هاوسەرگیری قەدەرە و بەخششێکی خوایە، چەندە ئافرەتی داپۆشراو هاوسەرگیریان کردووە لەبەرامبەردا چەندین ئافرەتی سفور و ناپۆشتە ماونەتەوە، نە باڵاپۆشی ڕێگر بووە لە هاوسەرگیری و نە ناپۆشتەیش بۆتە هۆکاری خوازبێنییان.

### ج- دەستگیرانەکەم یا هاوسەرەکەم ڕازی نییە بالاپۆش بم:

ئایا دەستگیرانەکەت یا هاوسەرەکەت زەمانەتی نەمردنت بۆ دەکەن، یا زەمانەتی بەهەشت؟! گوێ بگرە لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): (گوێڕایەڵبە تا ئەو کاتەی فەرمانت پێ دەکەن بە خراپە و بێ فەرمانی خوا، کاتێك فەرمانیان کرد بە سەرپێچی فەرمانی خوا ئەوا نە گوێڕایەڵی و نە ئیتاعەت کردن). الترمذي، بە قسەی خۆش بیدوێنە و گفتوگۆی لەگەڵ بکە تا قەناعەتی پێ دەکەیت، خۆ ئەگەر هەر سوربوو لەسەر خواستەکەی بەخۆدانەپۆشینت، ئەوا چارەنووستی پێوە مەبەستە، کەسێك وەها سەرپێچی فەرمانی خوا و پێغەمبەر بکات، نە خێری دونیای تێدایە نە قیامەت، خوای گەورە لە توانایدایە لەوە باشتر بکاتە نسیب و قەرەبووت بە باشتر بۆ بکاتەوە.

ئەگەر بالاپۆش بم کارەکەم لەدەست دەدەم، بەڵێ زۆرجار ئەمە ڕوویداوە، بەڵام لەدەستدانی کارەکەت باشترە لە لەدەستدانی ڕەزامەندی خوا، بزانە نەمانی کارەکەت بە مانای لەدەستدانی ڕزق و ڕۆزی نییە، ئیتر بمریت لەبرسان، بژێوی بەدەست پەروەردگارە و باشترت بۆ دەکات.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: (هەر کەسێك لەبەر ڕەزامەندی خوا گوێ بە خەشم و ڕقی خەڵکی نەدا، ئەوا خوا لە ئاتاجی خەڵکی قوتاری دەکات، هەر کەسێکیش ڕەزامەندی خەڵکی مەبەست بوو خستییە پێش ڕەزامەندی خوا، ئەوا خوای گەورەش وازی لێ دێنێ و دەیداتە دەست خەڵك). رواه الترمذي.

ح- ئەترسم دوای ئەوەی پۆشیم بێزارببم و لایبەرم:

هەرگیز خۆت تەسلیمی ئەم بیرکردنەوانە مەکە، ئەگەر تۆ دوودڵی و جارێ هەست دەکەیت دڵت بە خۆشییەکانی دونیاوە بەستراوە ئەوا پلە پلە بۆی برۆ، بیربکەرەوە لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا پێش ئەوەی لەدەستت بچێت و کاتت بەسەربچێت. ئەگەر خوای گەورە ئەو نیعمەتەی پێ بەخشیت و خۆت داپۆشی ئەوا هاوڕێیەتی چاکەکان و لەخواترسان بکە، ئامادەی وانە شەرعییەکان بەو قورئان بخوێنە، هەمیشە نزا بکە کە خوای گەورە یارمەتیت بدات و ڕاوەستاوت بکات لەسەر ئەم نیعمەتە، بزانە باڵاپۆشییەکەت تۆبە و گەڕانەوەیە بۆلای خوا، خوای گەورەش تۆبەکارانی خۆش دەوێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ﴾ هەمیشە بەردەوام بە لەسەر خوێندنی ئەم نزایە: (یا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك.. اللهم كما هديتني للحجاب فثبتني عليه حتى الممات). خوایەگیان چۆن ڕێنموونیت کردووم بۆ باڵاپۆشی، هەر ئاواش ڕاوەستاوم بکە لەسەری تا مردن.

خ- من هەموو عیبادەتەکان بەجێ دێنم و باوەڕیشم بەهێزە (دڵ حسابە) ئیتر جلوبەرگ چییە؟!

ئەگەر تۆ بەڕاستی ئیمانداریت ئەبێ هەموو فەرمانەکانی خوا جێبەجێ بکەیت و قبوڵی بکەیت، ئەوەی خوای پەروەردگار پێی ناخۆشە و نەهی لێ کردووە نزیکی نەبیتەوە و نەیکەیت. نەبیتە ئەو کەسانەی کە خوا لە بارەیانەوە دەفەرمووێت: ﴿ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ

ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ﴾ البقرة: ٨٥). واته: ( ئايا باوەڕتان هەیە بە هەندێك لە قورئان و بە هەندێکی بێباوەڕن، (بەخواست و ئارەزووی خۆتان) بێگومان ئەو کەسانە چارەنووسیان لە دونیادا سەرشۆڕی و شەرمەزارییە و لە قیامەتیش قورسترین سزا چاوەڕێیانە).

ئایا ئەو ئایەتەت نەخوێندەوە: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ﴾ الأحزاب: ٥٣.

واته: (ئەگەر داوای شتێك یا پێویستییەکتان لە خێزانەکانی پێغەمبەر کرد، لە پشتی پەردەوە داوای بکەن، ئەم جۆرە ڕەفتارە باشتر و پاکترە بۆ دڵی ئێوە و ئەوانیش).

ئەمە پاکتر و چاکتر بێ بۆ دڵێکی وەك عائیشە و فاتیمە و خەدیجە و هاوەڵان، ئایا دڵی تۆ لە دڵی ئەوان پاکتر و دامەزراوترە؟!!

د- من قەناعەتم بە باڵاپۆشی نییە، ئایا فەرزە یا سوننەت؟!

قەناعەت نەبوونت بە باڵاپۆشی و ئەو فەرمانەی خوا ئیسلامییەکەت ناتەواو دەکات، -پەنا بەخوا- چونکە تۆ بەهاتنت بۆ دینی ئیسلام، واتە: تەسلیم بوون بە هەموو فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئایا حەزرەتی (ئیبراهیم) سەلامی خوای لێبێت، کاتێك بەو تەمەنە زۆرەوە خوای گەورە کوڕێکی پێ بەخشی و دواتریش خستییە بەردەم ئەو تاقی کردنەوە قورسە، بە فەرمانکردنی

بەسەر بڕینی کوڕەکەی، ئایا دوودڵ بوو لە بەجێ هێنانی ئەم فەرمانە و پێویستی بەوە بوو کەسێك قەناعەتی پێ بکات؟!

ئایا (ئیسماعیل) ڕای کرد لە دەستی و بڵێ نایکەم؟ یا ملکەچی فەرمانەکە بوو بەم وتە جوانە:﴿ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُ﴾، ئەوە بکە خوا فەرمانی پێ کردووی. ئایا (خاتوو هاجر)ەی باوەڕدار و خۆڕاگر هیچ ناڕەزایەتییەکی دەربڕی وەك دایکێك؟ هۆکارەکەیان دەزانی؟ هەر وتیان بۆچی؟ چونکە دەیانزانی حیکمەتی خوایە و چەند و چونی تێدا نییە؟ ئیبراهیم و خێزانەکەی تاقیکرانەوە بە خۆشەویسترین کەسیان کە جگەرگۆشەکەیان بووە و ئارامیان گرت و تەسلیمی فەرمانی خوابوون... ئەی تۆ بۆ حیجاب و بەرگێکی پۆشتەت پێ قورس و ناسازە؟!

واباشترە ڕاستییەکە بڵێیت و دان بنێیت بە لاوازی ئیرادە و بێ توانایيت و داوای یارمەتی لە خوا بکەیت، ئەمە زۆر بەجێترە لەوەی بەرپەرچی خوا بدەیتەوە و بڵێی قەناعەتم پێی نییە!

ئێمە بەرپرسیارنین قایل بین بە فەرمانی خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەڵکوو بەرپرسین لە فەرمانبەرداری فەرمانەکانیان ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡ﴾ الأحزاب: ٣٦. واتە: (بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یا ژنێکی ئیماندار نییە کاتێك کە خوا و پێغەمبەری خوا بڕیاری شتێك دەدەن ئەوان سەرپشك بن لە ئەمجامدانی ئەو کارە)، چونکە ئەوەی سەرپێچی

بکات بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە، مەبە بەوانەی وتیان: ﴿سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا﴾ البقرة: ٩٣. لەبارەی ئەوەی ئایا فەرزە یا سوننەت؟ ئەوا ئەو ئایەتە ئاشکرایانەی قورئان بخوێننەوە و ماناکەی بزانە کە باس لە فەرزبوونی حیجاب دەکەن، وەك: ﴿وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ النور: ٣١. واتە: (بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە، با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا).

## ژ- هێشتا خوا هیدایەتی نەداوم:

چاوەڕێی ئەوە مەبە هیدایەت دێتە لات یان نا! خوای گەورە ویستی وایە، تۆ بە ویست و ڕەزامەندی خۆت بچیت بە دەمییەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ﴾ الرعد: ١١. واتە: (بێگومان خوا بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێك ناگۆڕێت هەتا ئەوان ئەوەی بەخۆیان دەکرێت نەیگۆڕن).

کەواتە قیامەت و ژیانی هەمیشەیی مەفرۆشە بە دونیایەکی کەم و بەسەرچوو. پێویستە هەوڵبەیت ڕەزامەندی خوا بەدەست بهێنیت، ئایا کاتێك سواری ئوتومبێلێك دەبیت و دەچیت بۆ سەفەر دەزانین ئەجەل ئەمانگەڕێنێتەوە بۆ شوێنی خۆمان؟! ئایا دەرمان و چارەسەر ناخۆین، لەکاتێکیشدا دەزانین چارەسەر لای خوایە، بەڵام وەك هۆکارێك بەکاری دێنین، دەتۆش هۆکارەکانی باڵاپۆشیت بەدەست بخە.

**ر- ڕقم لە باڵاپۆشییە، کە دەبینم هەندێ ئافرەتی باڵاپۆش هەڵسوکەوت و ڕەفتاریان ناشرینە!**

ئەمە بەداخەوە ڕاستە (لا حول ولا قوة إلا بالله)، بەڵام هەیە پێنج فەرزەکە بەجێ دێنێ و کاری خراپیش دەکات، هەیە حەج دەکات و لەپەنای ئەوەدا فرِوفێڵ و کاری ناشەرعی دەکات؟

ئایا نوێژ و فەریزەی حەج وازلێبێنین لەبەر ئەم کەسانە؟!

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ الإسراء: ١٥. واتە: (کەس سزای کەس هەڵناگرێت، کەس بەرپرسیار نییە لە هەڵەی کەسانیتر).

هەریەکێکمان لێپرسینەوەمان لێ دەکرێت لەسەر کاروکردەوەی خۆمان نەك کردەوەی کەسانیتر).



## ٤- ئێستا تۆ ئافرەتێکی پۆشتەیت؟

- (بەرگی شەرعیت هەڵبژارد)، پیرۆزت بێت، تۆ ئێستا نیشانەی بۆ ئیسلامەکەت تۆ کە بوویتە نموونە و پێشەنگ، مانای ئەوە نییە ئیتر لە هەڵە و تاوان پارێزراو دەبیت، مرۆڤ هەڵە دەکات، بەڵام ئامان هەڵە و نافەرمانییەکانت ئاشکرا مەکە و بێباك بیت لێیان، سوپاسی خوا بکە بۆ ئەو فەزڵەی پێی بەخشیت بە بالاپۆشیت، سوپاسی بکە کە دووری خستیتەوە لەو خراپەیەی زۆرێك لە خوشکانت تێی کەوتوون و پێوەی دەتلێنەوە بپاڕێرەوە لە خوا، تا ئەم نیعمەتی پۆشتەیش ببەخشێتە ئەوان.

- بە تەواوی مانا پۆشتەبە و حیجابەکەت مەکە بە هۆکاری جوانکاری و خۆڕازاندنەوەت، بە هەر هۆکارێك بێت بزانە کە تۆ ئێستا پۆشتەیت، پاداشتی ئەو گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریيەت بۆ هەژمار دەکرێت و وەریدەگریت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ النساء: ١٣. واتە: ( ئەوەی فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی بکات دەیخاتە ناو باخ و باخاتی بەهەشتەوە، ڕووبار و جۆبارەکان بەژێریاندا دەڕۆن هاوڕێ لەگەڵ ژیانی بڕاوەدا هەر ئەوەشە سەرفرازی و دەستکەوتی بێ سنور ).

تۆ بەو پۆشتەییەت لە خوا نزیك دەبیتەوە: (هەر کەسێك بستێك لێم نزیك بێتەوە من باڵێك لە ئەو نزیك دەبمەوە).

- تۆ دەبێتە خۆشەویستی خوا بەو نزیک بوونەوەت لێی، سەرەڕای ئەمانەش خوای گەورە پاداشتی ئەو ئارامگرییەت لەسەر قسەلۆکی کەسانی نەفام و بەرگەگرتنی گەرما پێ دەبەخشێ، هەروەها پاداشتی پەیڕەوانی چاکەکان وەردەگریت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (هەر کەسێك لەگەڵ ئەوەدا حەشر دەکرێ کە خۆشی دەوێت و شوێنی دەکەوێت).

جا چەندە جگە لەمانەش ئەجر و پاداشتی پاراستنی کۆمەڵگەت هەیە لە بەدکاری و فەساد و بەدڕەوشتی.

## ٥- ئافرەتە پۆشتەکان لەنێو خێزانی ناموڵتەزیمدا:

ئەو ئافرەتانەی کە پۆشتەن و لەنێو خێزانی بێ دین یاخود ناموڵتەزیمدان

زۆرجار ئافرەت لە نێو خێزانێکدایە کە لەگەڵ بیروباوەڕ و تەنانەت داب و نەریتیش بەهۆی دینەکەیەوە جیاوازن، جا لەنێو ئەم کەسوکار و خێزانەدا پێویستە چۆن ڕەفتار بکات، ئەوەی لەسەریەتی پێویستە سنورە شەرعییەکان بە هەر شێوەیەك بێت بپارێزێت، کە بزانن ئەم موسڵمانە و تێکەڵی ئەو داب و نەریت و کۆبوونەوە نامەحرەمانە نابێت کە ئەوان دەیکەن، بزانن کە ئەمە حوکمی ئیسلامە و پێویستە لەسەری وەك موسڵمانێك پابەند بێت پێوەی.

حیجابەکەی بپارێزێت و ئەو شوێنانەی خوای گەورە فەرمانیکردووە بە داپۆشینی دەرینەخات، بەهەر هەلومەرجێك بێت، هەر لە قژ و مل و

سنگ و قاچ و قۆڵ، ئیتر گەر عابا و پەچەشی نەبێ ئەوا قەینا، چونکە قورسە بتوانێت پابەندبێ پێوەی.

هەمیشە هەوڵی ئامۆژگاری ئەوانیش بدات بۆ ڕێگای ڕاست، چونکە هەریەك لەو دڵانەی لە دەوروبەرتن مەڵۆیەك لە ئیمانیان تێدایە، بەڵام تاوان و نەزانین پەردەپۆشی کردوون، جا لە سەرسوڕهێنەرەکانی زمانی عەرەبی ئەوەیە بەمە کە ئیمانەکەی شاراوە و پەردەپۆشە دەوترێت (کافر)، کافریش واتە: (ساتر) بە مانای داپۆشەر، کەواتە هەموو کەسێ ئیمان لەدڵیدا هەیە داپۆشیوە و پێویستی بە چاکەکار و ئامۆژگاریکەرێکە بیداری بکاتەوە. بۆیە هەرگیز سڵ مەکەرەوە لە ئامۆژگاری با ئەو کەسە لە هەر ئاست و بێباوەڕییەکدا بێت.

هەمیشە ئامۆژگاری پێویستە بە نەرمی و قسەی جوان و لەسەرخۆبێت، وەك ئەو خۆڵەمێشەی تەنها پشکۆیەکی بچوکی تیادا ماوە و گەر بمانەوێت جارێکیتر گەشی بکەینەوە، پێویستی بە دانایی و لێزانینە تاکوو بگەشێتەوە، چونکە ئەگەر داری گەورە بکەینە پاڵی بۆ گڕسەندنەوەی، ئەوا نەك گڕ ناسێنێ، بەڵکوو خۆیشی دەکوژێتەوە و دەبێتە خۆڵەمێش، کە فووی زۆری لێ بکەی پەرش و بڵاو دەبێ و نامێنێ. خۆی ئەگەر هێواشیش بێت ئەوا هیچ کاریگەری نابێت. کەسی دانا ئەوەیە پوشوپەڵاش بێنێ و بەرە بەرە بتوانێت بەو پشکۆیە ئاگرێکی بڵێسەدار بکاتەوە.

ئەم کچەش دەتوانێت بە عەقڵ و ژیری و مامەڵە و شێوازی جوان، کاریگەری لەسەر دەوروبەرەکەی هەبێت و بانگیان بکات بۆ ئیسلام،

پێویسته به ڕێزگرتنی دایك و باوكی و دەربڕینی خۆشەویستی بۆیان و بەپێی ئاستی خۆیان وتوێژیان لەگەڵ بكات، بزانێت هەرگیز لەگەڵ دایك و باوك وەك مامۆستایەك قسە نەكات و خۆی بەسەرتر لەئەوان بزانێت. بۆ برا و خوشكه بچوكەكانیشی به ڕەفتاری جوان ئیسلامییان پیشان بدات، بەخۆشەویستی و كڕینی دیاری بچوك خۆشەویستی و دینەكەی بخاته دڵیان. پێویسته به شێوازی منالانه و بەپێی تەمەنی خۆیان بیاندوێنێت، تەماشاكە: چارەسەر كاتێ دەدرێت به نەخۆش بەپێی ڕەچەتەكەی دكتۆر و ژەمە ئەوا چارەی دەكات، خۆ ئەگەر هەر ئەم چارەسەره به یەكجار بدرێته نەخۆشەكە، ئەوا دەیكوژێت و بەرەو گۆڕی دەبات، پێویسته دایك و باوك و كەسەكانت هەر چ دینێك بن ئەركی خۆت بەرامبەریان بەجێ بهێنیت، لاسار نەبی لەگەڵیان و ڕقیان لێت نەبێ و دەمە دەمە و دەمەقاڵەیان لەگەڵ نەكەی.



# وەرزی شەشەم چۆن وتوێژ لەگەڵ دایک و باوکت دەکەیت

## ١- بۆچی ناکۆکی لەنێوان دایک و باوک و منداڵدا سەرهەڵدەدا؟

بەزۆری ناکۆکی لەنێوان منداڵ و دایک و باوکدا لەسەر ئەم بابەتانە دروست دەبن:

أ- کۆشش نەکردن لە وانەکانت، هەمیشە دایک و باوک خوازیارن تۆ زیاتر گرنگی بە خوێندن و وانەکانت بدەیت، بەتایبەت ئەو کاتەی دەزانن نمرەکانت دابەزیوە و وانەکانت پشت گوێ خستووە. بۆچی لەمە توڕە و دڵگران دەبیت؟! پێویستە دڵخۆش بی و بزانیت زۆر کەس هەن لەهاوڕێکانت کە تامەزرۆی ئەوەن دایک و باوک و دەوروبەر گرنگی یان پێ بدات لەخەمی دابن تۆ بە گوێڕایەڵی دایک و باوکت دەتوانی نمرەکانت بەرزبکەیتەوە و دەروونی خۆیشت ئارام بکەیت و ڕەزامەندی ئەوانیش بەدەست بهێنیت.

ب- زۆر بێداری و کەمخەوتن: ڕەفتارێکیتر کە دایک و باوک بێزارن لێی درەنگ نووستن و مانەوەیە تا درەنگانی شەو، لێرەدا پێویستە دایک و باوک نیگەران بن و بێنەدەنگ، ئیتر تۆ بۆ بەخۆهەڵقورتاندن لە

کاروباری کەسێتی دای دەنێیت؟! سوپاسیان بکە لەسەر ئەم خەمخۆرییەیان بۆت، داوایان لێ بکە یارمەتیت بدەن، وەك ئەوەی دەنگی تەلەفزیۆن نزمکەنەوە و قاو و قیژی منداڵە بچوکەکان نەهێڵن و ئارامی ماڵەکە ڕاگرن، لە کاتی نووستندا بۆئەوەی هاوکارت بن لە کاتی خۆی بخەوی، بەم جۆرە هەم خۆت تەندروست دەبی و نیگەرانییەکانی ئەوانیش نامێنێت.

ت- هاوکاری نەکردنت لە کاروباری ناو ماڵدا: زۆرێك لە کوڕان و کچان کەمتەرخەمن لە یارمەتی دان و هاوکاری لەناو خێزانەکانەکەیاندا، یارمەتیدان و هەستان بە هەندێ کار، وەك ڕێککردنی پێخەف و جل و کتێبەکان... هتد. هەرچەندە کارێکی بچوکن، بەڵام دایکت دڵخۆش دەکەیت و ئاسودەیی پێ دەبەخشی، بەوەی هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکەیت لە ماڵەکەدا، ئامادەکردنی چایەك یا شەربەتێك بۆیان، یاخود گرتن و سەرگەرمکردنی منداڵە بچوکەکان کاتێك ئەوان سەرقاڵی کارن، چەندە دەوروبەرت دڵخۆش دەکەن.

هەرگیز ئەو فرسەتانە لەدەست مەدە و خۆت هەستە بە ئەمجامدانیان پێش ئەوەی پێت بڵێن، بۆڵەبۆڵ مەکە و قەڵس مەبە کاتێ هەڵدەستی بەو کارانە و وابزانن بە نابەدڵی دەیکەیت، ئەمجامدانی ئەو کارانە لەگەڵ ئەوەی فێردەبیت و ئەزموون پەیدا دەکەیت بۆ سبەینێی ژیانی خۆت، سۆز و خۆشەویستیت زیاد دەکەن بۆ خێزانەکەت، ئەو خێزانەی لە ساتی لەدایك بوونتەوە تا ئێستا ڕەنجت لەگەڵ دەکێشن، خۆ ئەگەر میوانێکیش بیت لەو ماڵەدا شەرم دەتگرێ

هەروا دانیشی و تەماشاکەیت خزمەتت بکەن، جا چ جای ئەوەی کچی ماڵەکە بیت و لەناز و خۆشەویستی یاندا بیت؟!

ئایا وادەزانی هەستی بەخشش و دەست و دڵ کراوەیی تەنها واجیبی دایك و باوکە؟ یا تۆش دەبێت ئەو بەخشش و خۆشەویستییەیان لە بەرامبەردا بدەیتەوە، هەرگیز سودی خراپ لە خۆشەویستی و نازی دایك و باوکت وەرمەگرە و مەهێڵە خۆپەرستی زاڵ بێت بەسەرتدا. هەمیشە پێگەشتووبە با تەمەنیشت بچوك بێت، تێگەشتووبە با ئەزموونیشت کەم بێت، ڕێز لەو خزمەت و کارانە بگرە کە دایك و باوکت بۆیان کردووی بە گوفتار بێ یان کردار و هاوکاری کردنیان.

پ- هاموشۆ و دیدەنی هاوڕێکانت: زۆرجار دایکت ناهێڵێ بچیتە ماڵی هاوڕێکانت، بەڵام گەر ئەوان بێن ڕێگری ناکات، هەولبدە دایکت بە هاوڕێ و دایکی هاوڕێکانت بناسێنیت، چونکە بێگومان دایك دەبێت دڵنیابێ لە دین و ڕەوشتی هاوڕێ و خێزانەکانت، ئەوەش لە خۆشەویستی و خەمخۆرییەتی بۆ تۆ. ئەوە بە مانای ئەوە نییە وابزانی کۆت و بەندت دەکات، یا دژی تۆیە، بزانە بوونت لەگەڵ دایك و باوکت هەلێکە بۆ بەدەستهێنانی ئەزموون و فێربوونی مامەڵە و هەڵسوکەوتی دروست لە هەموو لایەنەکانی ژیانەوە، ئەوەی ئەوان دەیزانن و پێیدا تێپەڕبوون تۆ نایزانی، سبەینێ بە ویستی خوا تۆش ژیانی تایبەتی خۆت و هاوسەر و منداڵت دەبێت، ئەوکاتە و بەو ئەزموونانەی لەوان

وەرتگرتووە دەتوانی ئەو بەرپرسیارێتیە گەورەیە هەڵگری و بەرێی ژیاندا بڕۆیت.

ج- زۆر بەکارهێنانی مۆبایل: بۆ کارێکی گرنگ یا زەرورەتێك نەبێت مۆبایل بەکارمەهێنە، هەرگیز بۆ سەرگەرمی و بەسەربردنی کات مەیگرە بە دەستەوە، چونکە کاتت بەفیڕۆ دەدات.

ح- هەڵسوکەوتی هەراسانکەر: هیچ کات کارێك مەکە دەوروبەرت بەتایبەت دایك و باوکت هەراسان بکەیت، وەك داخستنی دەرگا بە توندی، یا بەرزکردنەوەی دەنگی تەلەفزیۆن و شتیتر، یا قیژە و هاوار بەسەر ئەندامانی خێزاندا و شەڕکردن و دەمەدەمە لەگەڵیان.

## ٢- شێوازی گفتوگۆکەت چۆن بێت؟!

- بزانە ناکۆکی و ڕاجیایی دایك و باوکت لەگەڵ تۆدا ئەوە نییە بیانەوێت زاڵ بن بەسەرتداو هەمیشە تۆ ژێر دەستەیان بیت، ئەوان بەهۆی دڵسۆزییانە بۆت هەر مامەڵەیەکت بەرامبەر دەکەن، چونکە تۆ ئەمانەتی لە گەردنی ئەوان، ئەوان بەرپرسن بەرامبەرت لای خوا و هەروەها لای خەڵکیش. کاتێك ئەمە تێگەیشتی بەباشی و هزرێکی کراوەوە، ئەوا دەزانی تۆ لە لێواری توشبووندایت بە خراپە و تاوان لە هەقی دایك و باوکت، کە قەرەبووکردنەوەی مەحاڵە.

- هەمیشە دەرگای گفتوگۆ و لێکتێگەیشتن لەگەڵ دایك و باوکت با کراوە بێت، پەتی خۆشەویستی هەرگیز مەپچڕێنە.

- بپرسە بزانە بۆچی ئەو کارەیان بەدڵ نییە، بەڵام بەهێمنی و ئەدەبەوە وتووێژیان لەگەڵ بکە.
- ئاگاداربە تۆ قسە لەگەڵ دایك و باوکت دەکەیت، قسەکردن لەگەڵ ئەوان زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەو شێوازەی لەگەڵ هاوڕێ و هاوتەمەنەکانی خۆت.
- ئاگات لێ بێت با قسەکانت لەسەرخۆ و هاوسەنگ بن و دووربن لە هەڵە و هەڵچوون، نەرم و نیان بە و شەرع و عەقڵ لە قسەکانتدا زاڵ بن بەسەر ئارەزووەکانت.
- سود لە قۆناغی هەرزەکاریت وەرگرە و بە گفتوگۆی مەنتیقی و دروست تواناکانت باش بکە، بەسنگ فراوانی و قسە وەرگرتن کەسێتیت جوان بکە، ئەمە سیقە و متمانەی دایك و باوکت بە تۆ زیاد دەکات و ئەو دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەی هەیانە لەسەرت کەم دەبێتەوە، هەر ئەمەشە لەناوەندی خوێندندا ڕەنگ دەداتەوە و ئاسان دەبێت پەیوەندیکردنت لەگەڵ مامۆستا و هاوڕێکانت.
- هەمیشە چاکە و خۆشەویستی دایك و باوکت لەبیربێت، ئەو چاودێری و نزا خێرانەیان هەرگیز لەبیر نەکەیت.
- بەچاوی ویژدان و پێزانینەوە تەماشایان بکە و ڕێز لەو هەوڵ و ماندووبونەیان بگرە لە پێناو تۆدا و تاکۆتایی تەمەن داویانە بۆت.
- هەوڵبدە تێبگەیت بۆچی دایکت هەڵوێستی لەسەر ڕەفتارێك ئەرێنییە، چ هۆکارێك پاڵی پێوە ناوە وا ڕەفتار بکات.

- جوان گوێی بۆ بگرە کە قسەت بۆ دەکات با هەست بکات گرنگی بە قسەکانی دەدەیت.

- سۆزی بۆ دەربڕە، تەنانەت ئەو کاتەش کە ناکۆکە و سەرزەنشتت دەکات، پێی بڵێ: (قسەکانت ڕاستە، ڕێز لە بۆچوونەکەت دەگرم، تۆ دایکیت و دەبێت هەڵوێستت وابێ، سوپاسی خەم خۆریت دەکەم).

- هەڵوێستی خۆتی بۆ ڕوون بکەوە بە وردی جوانی پێی بڵێ بۆچی ئەو بۆچوونەت بووە، یا ئەو ڕەفتارەت کردووە، هەمیشە با بزانێت تۆ ئەوت بۆ گرنگە پێش هەر قسەیەك وشەی (دایك) بەکاربێنە.

پێی بڵێ لێت تێدەگەم و ڕێز لە بۆچوونەکەت دەگرم، بەڵام دید و بۆچونی من لەگەڵ تۆدا جیاوازە، داوای هەلی لێ بکە تا بۆی ڕوون بکەیتەوە.

- لەبری وشەی زبر و ڕەق هەوڵبدە وشەی نەرم و جوان بەکاربێنیت.

- ئەگەر نێوانی تەمەنیشتان زۆر بوو، هەرگیز ئەم قسەیە بەکار مەهێنە: ئێمە جیاوازیمان زۆرە و من نەوەیەکم و تۆ نەوەی کۆنی و لەم بابەتە، هەمیشە کاتێکی گونجاو هەڵبژێرە بۆ قسەکردن و خستنەڕووی بۆچوونەکانت لەگەڵی.

- پێی نیشاندە کە ئەگەر لە ڕایەکیشدا ناکۆکن، بەڵام ئەو هەر دایکتە، گەورە و بەڕێز و خۆشەویستە لەدڵتدا.

• باڵی سۆز و میهرەبانی بکێشە بەسەریانداو ملکەچیان بەو بە وشەی شیاو بیاندوێنە، هەرگیز شێوازی هەڵچوون بەکارمەهێنە، ئەوە دایکتە، ئەو دایکەی خوای گەورە فەرمانت پێ دەکات ئۆفێکی پێ نەڵێی ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ﴾ الإسراء: ٢٣.

هەرگیز دایك و باوك بەبێ هۆ لە منداڵەکانیان توڕەنابن، بزانە هەڵەیەك دەبینن و دەیانەوێ بۆت ڕاست بکەنەوە، ئایا هەرگیز دایك و باوك لەسەر سەرکەوتنی منداڵەکانیان لە خوێندن و کاری باش توڕەدەبن لە منداڵ و شەڕی لەگەڵ بکەن؟!.

## ٣- چۆن متمانەی دایك و باوکت بەدەست دێنیت؟

هەمیشە کارێك بکە کە ئەوان پێیان خۆشە، شتێك مەکە ئەوان پێی نیگەران بن و حەزی پێنەکەن.

- کاتێك دایك و باوکت دەبینن لەگەڵ برا و خوشکەکانت بەجوانی و میهرەبانی ڕەفتار دەکەیت و ئازاریان نادەیت، کاتێك دەبینن نوێژەکانت لەکاتی خۆیدا ئەمجام دەدەیت بێ کەموکورتی.

- کاتێك دەبینن ڕاستگۆیت لە قسەکانتدا، کاتێك دەبینن ئەرکەکانی خوێندنت بەباشی بەجێ دەهێنیت.

- کاتێك هەرچی ئاکار و ڕەوشتی جوانە تیاتدا بەدی دەکەن. ئیتر ئەو کاتە متمانەیان بەدەست دێنیت، نەك هەر متمانەی دایك و باوك، بەڵکوو متمانەی خەڵك و دەوروبەریشت.

## ٤- ببە بە هاوڕێی دایکت:

- وابکە لەدایکت وەك هاوڕێیەك لەگەڵت بێت، هەر وەك چۆن دەبێت دایکیش کچەکەی بکاتە هاوڕێی خۆی، هەمیشە ڕاوێژی پێ بکە و ڕای وەرگرە لەسەر هەر کارێك کە دەیکەیت، پێی بڵێ: ڕات چۆنە لەبارەی ئەو کارەوە؟ هەرگیز گاڵتە بە ڕاوبۆچوونەکانی مەکە، با قسەکانی هەتا ئەگەر هەڵەش بێت یا گونجاو نەبێت، بەڵکوو بە ئەدەبەوە بۆی ڕاستکەرەوە.
- لە چۆنیەتی قسەکردن و ڕێگاکەی ئاگاداربە کاتێك دەتەوێت ڕاوێژی پێ بکەی، بڵێ مۆڵەتم دەدەیت، یا کاتت هەیە؟.
- بەردەوام بڵێ ئیشت نییە، یارمەتیت بدەم بۆ ئەو کارە.
- ئەگەر لە دانیشتن و میوانییەك دایکت قسەی کرد پێی مەبڕە، یا مەڵێ وانیە و وایە، ئەوە بەدرۆ خستنەوەیە.
- ڕێز لەو بەڵێنانە بگرە دەیدەیتێ، بۆ نموونە دەڵێی کاتژمێر ئەوەندە دێمەوە ماڵەوە، سوربە لەسەر ئەوەی لەو کاتەدا بگەڕێیتەوە، چەندەها نووسەر و شاعیر نووسین و شیعرەکانیان تەرخان کردووە بۆ زەحمەت و ڕۆڵی گەورەی دایك بۆ ڕۆڵەکانی، کە دەتوانی بیخوێنیتەوە بزانیت دایك چیە؟.

***

## ٥- جیاوازی کردن لەنێوان کوڕ و کچاندا:

لەوانەیە هەندێك دایك و باوك لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتدا جیاوازی بکەن و گرنگی زیاتر بە کوڕ بدەن، ئەمەش ڕق و قین لەدڵی کچەکاندا بەرامبەر براکانیان دروست دەکات. ئەم دایك و باوکانە بیریان چووە کە پێویست و واجبی شەرعییە دادپەروەربن لەگەڵ منداڵەکانیاندا و بەیەك چاو سەیریان بکەن. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (لەسەرتە دادپەروەربیت و جیاوازی نەکەی لەنێوان منداڵەکانت، هەرچۆن ئەوان لەسەریانە گوێڕایەڵ و چاکەکاربن بەرامبەرت). رواه البيهقي.

بەڵام باش بزانە ئەم دادپەروەری و عەدالەتە بەو مانایە نییە کوڕ هەرچی کرد بۆ کچەکەش هەبێت بیکات، بۆ نموونە کوڕ پێویستە لە بازنەی دەرەوەی خێزان زۆر ڕووبەڕووبونەوەی هەبێت، لەگەڵ باوك یا برا گەورەکەی بچێتە دەرەوە تا کاروباری دەرەوەی خێزانەکەی فێربێت، وابیر تەسك مەبە وابزانی ئەمە جیاوازییە و فەزڵی ئەو ئەدەن بەسەر تۆدا، یا گرنگی بە تۆ نادەن، لەزۆر کاروباردا بەراورد ناکرێ لەنێوان کوڕ و کچدا و هەر یەکێکیان بۆ ئەرکێکی جیاواز لەویتر دروستبوون، بەڵام تەواوکەری یەکترین.

لەوانەیە ئەگەر بەڕووکەش بیری لێ بکەیتەوە بڵێی: من دەخوێنم - براکەشم دەخوێنێ، من کاردەکەم ئەویش کار دەکات، من پارە پەیدا دەکەم ئەویش بە هەمان شێوە، ئیتر ئەم جیاوازییە بۆ؟!

ئەگەر جیاوازییەکە لەوەدایە کە براکەت لەگەڵ هاوڕێکانی تا درەنگانێك لە دەرەوە بەسەر دەبات، بێ چاودێری و گرنگیدانی دایك و باوکت، ئەوا کەمتەرخەمییە لە هەقی براکەت، نەك فەزڵ و زیادە خۆشەویستی. پێویست و باشتروایە تۆ سەرنجی دایك و باوکتی بۆ ڕاکێشی، پێیان بڵێی کەمتەرخەم نەبن لە براکەت، نەك تۆش ئەبێ وەك ئەو بچیتە دەرەوە.

دکتۆرە (نەجات جەمیل) لە کتێبەکەیدا (أضواء علی الطریق) دەڵێ:

(ئەگەر بە واقعی بڕوانیت، زۆر جیاوازی دەبینی لەنێوان خۆت و براکەت کە بەدەست دایك و باوکت نییە.

تۆ بە ئاسانترین شت دەگریت و هەمیشە فرمێسکەکانت حازرن، هیچ شەرم ناکەی لە هاتنە خوارەوەیان، بەڵام براکەت زیاتر بەرگە دەگرێت لە قورسترین هەڵوێستەکانیشدا شەرم دەکات کەسێك فرمێسکەکانی ببینێت.

تۆ کاتێك مێرووپەك، قالۆنچەیەك دەبینیت دەقیژێنی و هاواردەکەی بێن بەدەمتەوە، بەڵام ئەو دەیگرێ بەدەستییەوە یاری پێدەکات، ڕائەکات بەدوای تۆدا پێتەوەنێ و بتترسێنێت.

تۆ پڕیت لە سۆز و مێیینەیی و نەرم و نیانی و دایکێتی، ئەویش پیاوەتی و هێز و بوێری و فەرماندارێتی، تۆ ئامادە دەکرێیت کۆرپەلە لە هەناو هەڵگری و مناڵ لە باوەشت دەگری، شیری پێ دەدەی چاودێری دەکەیت.

ئەو باوکە ڕووبەڕووی سەختی مەینەتییەکانی ژیان دەبێتەوە و لە خێزان و ژن و مناڵەکەی لادەدات.

ئەو پیاوە سنوری وڵاتەکەی لە تەماعکار و تاوانکار دەپارێزێت.

نموونەکان زۆرن بۆ جیاوازییە سروشتییەکانی نێوان کوڕ و کچ، کە خوای گەورە داینناوە تا ژیان بەردەوام بێت بە هەردووکیان، دەتوانیت خۆت بگەڕێی و بیاندۆزیتەوە تا ئەو هەستە وەدەرنێی لەخۆت، هەستی دوو دڵی و ڕقاوی کە وا دەزانی جیاوازیکردنی دایك و باوکتە لەنێوان تۆ و براکەت.



## وەرزی حەوتەم

# تۆ و هاوڕێکانت

لەوانەیە یەکێك لە هاوڕێکانت لە ڕادەبەدەر خۆش بوێت، بەڵام ئایا پرسیارت کردووە لەخۆت: ئایا ئەم خۆشەویستییە پاك و بێ خەوشە لەپێناو خوادا، یاخود خۆشویستنێکە لەپێناو بەرژەوەندی و سۆز و هەست دروست بووە ! ؟

ئایا هاوکار و دەستباری یەکترن لەسەر خواپەرستی و پەرستشەکان؟

- ئایا ئامۆژگاری یەکتر دەکەن لەسەر بابەتە دینییەکان؟

ئایا هەڵە و کەم و کوڕییەکانی خۆتی تێدا ئەبینیتەوە (وەك ئاوێنەیەك)، وەك حەزرەتی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: (رحم الله امرأ أهدى اليَّ عيوبي). واتە: ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی عەیب و کەم و کوڕییەکانی خۆم پێ دەڵێ و ڕێنموونیم دەکات.

لەپێناو خوا خەڵکت خۆشبوێت و ڕقیشت لەبەر خوابێت، بتەوێت لەبەر خوا، وازی لێبێنە لەبەر خوا، ژیانت هەموو بۆ خوا بێت.

ئەوە قەیناکە خوشکێك هەڵبژێری و زیاتر لێوەی نزیك بی و لەلای ئەو هەست بە ئاسودەیی بکەیت، بەڵام نابێت کەمتەرخەم بیت بەرامبەر ئەوانیتر.

هەموو هیوا و هەست و نەستت بەیەك هاوڕێ وە مەبەستە، ئەو قسەیە وەبیر خۆت بێنەرەوە: ئەگەر کەسێکت خۆشویست بیر لەوەش بکەرەوە لەوانەیە ڕۆژێك بێت ئەو خۆشەویستییەت بۆی نەمێنێ، ئەگەریش ڕقت لە کەسێ بوو، بیر لەوە بکەرەوە لەوانەیە ڕۆژێك بێت خۆشت بوێت، وەك کوردەواری خۆشمان دەڵێت: (بەشی دوایی تیابهێڵیت لە هەردوو بارەکەدا)، لەکاتی ڕق و خۆشەویستییدا. لەوانەیە خۆشەویستیی هەندێك جار یەك لایەنە بێت و کەسی بەرامبەر ئەو هەستە گەرم و سۆزە لێشاوەی نەبێ بۆت.

نزا بکەین (خوایە گیان وامان لێ مەکە کەسێکمان خۆش بوێت و ئەو خۆشی نەوێین).

## ١- چۆن خۆشەویستی بۆ هاوڕێ خوشکەکانت دەردەبڕیت

- بێ پەردە خۆشەویستی خۆتیان بۆ دەربڕە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فێرمان دەکات کە کاتێك برایەك برایەکی خۆشویست، یاخود خوشکێك خوشکەکەی خۆشویست ئەوا با پێی بڵێ، بۆیە دوودڵ مەبە لە وتنی ئەوەی بە خوشکە ئیمانییەکەت بڵێیت: خۆشمدەوێیت.
- وەسف و سەنای ڕەوشتە جوان و سیفاتە باشەکانی بکە، پێی بڵێ: حەزم لە شێوازی نووسینتە، یا شێوەی قسەکردنەکەتم بەدڵە...).

- ئەگەر شەرمنیت و ڕووت نایە ڕووبەڕوو پێی بڵێیت، ئەوا دەتوانی بە نووسین لە ڕێگای نامە، یا لەگەڵ دیارییەکی بچوکدا ئەو هەست و خۆشەویستییەی هەتە بۆی پێی بگەیەنیت.
- لەخۆت بپرسە بۆچی ئەم خۆشەویستییە لە ڕادەبەدەرە؟
- هەمیشە با عەقڵت زاڵ بێت بەسەر دڵتدا، هەرگیز مەیەڵە خۆشەویستی مرۆڤەکان هەرکەس و لە هەر ئاستێکدا بێت، غافڵت بکا لە خۆشەویستی خوا.
- ئایا هەموو ئەو نیعمەتانەی لە چواردەورت هەیە بەخشش و بەهرەی خوای گەورە نین؟ ئەی بۆچی خۆشەویستیت بۆ خوشکەکەت وەهابێت هەمیشە لەبیرت بێت و لەولاشە پەروەردگار لەبیرکەیت؟!
- پاکی دڵ و دەروونت بە نزیکبوونەوە لەخوا بپارێزە، پەنا بەخوا بگرە و بیکە پشتیوانی خۆت دڵت پڕ دەکات لە خۆشی و ئارامی، پەروەردگار هەرگیز بەندەکانی غافڵ ناکات و وازیان لێ ناهێنێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ البقرة: ١٤٣.



## ٢- خۆشەویستی لەنێو خواناساندا:

(شێخ علی الطنطاوی) ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەبارەی (خۆشەویستی ئیمانی لەنێو ئافرەتە خواناسەکاندا) دەڵێت:

زمانی مرۆڤ کورت و دەستەوسانە لە دەربڕینی هەست و سۆزەکانی، هەروەك بێ توانایە لە وێناکردنی هەندێك دیمەنی سروشتی.

کێ هەیە بتوانێت بە قەڵەمەکەی وێنەی ڕەنگەکانی ئاسمان لەکاتی خۆرئاوابووندا و لە کەناری دەریایەکدا بکێشێت؟ یاخود شێوەی ئەو گوڵانەی تازە پشکوتوون دوای باران؟ وشەی خۆشەویستی یەك وشەیە، بەڵام بەزۆر ڕەنگی جیاواز بەکاردێت، ئەوەی کە هەموو جیاوازییەکان نزیك و وابەستە دەکات بەیەکەوە، دەڵێن: باوەڕدار خوای خۆش دەوێت، دایك منداڵەکانی خۆشدەوێت، هاوسەران یەکتریان خۆشدەوێت، موسڵمانان یەکتریان خۆشدەوێت.

بەمانە هەموو دەڵێن خۆشەویستی، ئەی کوا خۆشەویستی لەخۆشەویستی؟! لای هەندێك کەس خۆشەویستی بۆ خوا و خۆشەویستی بۆ غەیری خوا تێکەڵ دەکرێت، هەتا خاوەنەکەی وا پەی دەبات ئەمە لەوە، نا لەویش نییە، ئەی خۆشویستن بۆ خوا چییە؟

خۆشویستن لەبەر خوا، یا بۆ خوا واتە: کەسێکت خۆش بوێت، نە تەماعت بە ماڵ و سامانی هەبێت، نە بۆ چێژ وەرگرتن لە جوانییەکەی بێت، نە لەبەر پلەوپایەی بێت، نە بۆ قسەخۆشی، نە بۆ ئەوە بێت بەهۆی ئەوەوە سودێکت دەست کەوێت، یا بۆ ئەوە بێت زیانێکت لێ لادات، ئەمانە هیچ نەبێت، بەڵکوو تەنها لەبەر ئەوەی کەسێکی چاکە،

خواناسە، کاردەکات بۆ ڕەزامەندی خوا، شوێن شەرعی خوا دەکەوێت. ئەمانە پاڵنەرن بۆ خۆشویستنی ئەو کەسە. خۆ ئەگەر لەبەرئەوەی شتێکی حەڵاڵت لێی دەستدەکەوێت خۆشەویستیت بۆی زیاتر بێت، ئەمە هیچی تیا نییە و قەیناکە، چونکە فیترەتی مرۆڤ وەهایە ئەو کەسەی خۆشدەوێت کە باشە بۆی.

ئەگەر قوتابییەکی زانکۆ لەبەر خوا هاوڕێیەکی خۆشویست، ئەوا پێی خۆشە هەموو خوێندکارانی تریش خۆشیان بوێت لەگەڵی، چونکە ئەمە دەچێتە بواری هاوکاریکردن و هەماهەنگی لەسەر چاکە و خواناسی، هەتا هاریکارەکان زۆرتربن خێرەکەی زیاترە و سودی زۆرتر دەگرێتەوە.

بەڵام ئەگەر حەزی نەکرد کەس لەگەڵی بەشداربێت لەو خۆشویستنە، ویستی تەنها خۆی خۆشی بوێت و هاوڕێی بێت، پەیوەندی و دۆستایەتی هەمووی بۆ ئەو بێت، کەسیتر بەشدار نەبێت لەگەڵی، ئەمە خۆشەویستی لەبەر خوا نییە و نە خۆشەویستی بۆ خوایە.

لە نیشانەکانی خۆشەویستی لەپێناو خوا ئەوەیە: کە هیچ پەیوەندییەکی کەسێتی لەنێوانتاندا کاریگەری نابێت، لەبەرچاوت یەکسانە پیرێکی ڕووناشرین، گەنجێکی جوان، ئەوەی پشتت تێدەکات، ئەوەی ڕووت تێدەکات، مادەم لە تاعەتی خوای پەروەردگار یەکسانن و چوونیەکن و پابەندن بە شەرعی خواوە، لەبەر چاوی تۆیش خۆشەویست و وەك یەکن.

بەڵام ڕق لەبەرخوا: واتە کەسێکت ڕق لێبێت کە بێباوەڕە و خوای خۆشناوێت:

﴿لا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ المجادلة: ٢٢.

واتە: (نابینیت کەسانێك باوەڕیان بە خوا و بەڕۆژی دوایی هەبێت، کەسانێکیان خۆشبوێت کە دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، هەرچەندە ئەوانە لە باوانیان بن، یا براکانیان یا نەوەکانیان یا عەشیرەتەکانیان بن). کەواتە: با نزیکترین کەست بێت مادام دژایەتی خوا و بەرنامەکەی کرد خۆشت ناوێ و لەبەر خوا ڕقت لێیەتی.

### لە دەرەنجامەکانی ڕق لێبوون لەبەرخوا:

ناهێڵێت بەتەنگ دوژمنانی خواوە بیت، ئەگەر ناکۆکی و دووبەرەکی کەوتە نێوان موسڵمان و بێباوەڕ، تۆ لە ڕیزی کافرەکان نابیت، هەتا ئەگەر سیاسەت و بەرژەوەندیشت پێویست بکات: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ﴾ المائدة: ٥١.

بە لایەنگری ئەوان و هاوکارییان بەسەر موسڵماناندا دەچێتە ڕیزی ئەوان و خۆی لە کۆمەڵی موسڵمانان دەردەکات، بەڵام خۆشڕوویی و پەیوەندی باش لە ژێر ناوی پێکەوە ژیان لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی ئیسلام ناکەن، مامەڵەکردنیان بە دادپەروەرانە ئەوا قەدەغە نییە:

﴿لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ﴾ الممتحنة: ٨.

واتە: (خوا جڵەوگیری ئەوەتان لێ ناکات کە چاك ڕەفتار و دادپەروەربن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە جەنگیان دژ نەکردوون و دژایەتی ئاینیان نەکردوون، لە شوێنەوارتان دەریان نەکردوون).

ئەویش تەنها چاك ڕەفتاری و دادپەروەری، نەلایەنگرییە، نە خۆشەویستی. خۆ ئەگەر دژایەتی و شەڕیان لەگەڵ کردین بە چەك و پیلانگێڕی و گزی، یا بە هێرشی فیکری ئاشکرا، کە مەبەستیان دەرچوونی مناڵەکانمان لە دین، یا بیانکەنە یاخی و ئاشوب لە دینەکەیاندا، ئەوا ئیتر هیچ پێکەوە ژیانێك نابێت لەنێوانماندا.

بەڵام (ذمي) پەیماندەر بە ئیسلام و لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا بن، واتە هاوڵاتی ناموسوڵمان لە وڵاتی ئیسلامیدا، چی بۆ ئێمە بێت بۆ ئەوانیشە، چی لەسەر ئێمە بێ لەسەر ئەوانیشە، هەتا ئەو کاتەی لەسەر پەیمانی خۆیان بن کە لە نێوانماندا هەیە، لە مەرجەکانی پەیماننامەکەش ئەوەیە نەچنە پاڵ دوژمن، بانگەواز بە ئاشکرا بۆ دینەکەیان نەکەن، دروشمەکانیان دەرنەخەن، ئەمانە و چەندان مەرجی تر کە لە کتێبە فیقهییەکاندا هەن، ئەگەر سەرپێچی ئەم مەرجانەیان کرد هیچ پەیمانێك لە نێوانماندا نامێنێت.

ئیسلام واجبی کردووە لەسەر شانمان، کە پەیوەندی دینی لەپێش پەیوەندی هاونیشتیمانی بوونەوە بێت، تەماشاکە (أبو لهب) هاوڵاتییەکی مەککە بوو، کەلەسەرەوەی خەڵکەکە بوو، قورەیشی

هاشمی بوو، مامی پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم)، لەکاتێکدا لە نوێژدا و لەبەردەم خوادا وەستاوین جنێوی پێی دەدەین (تبت یدا).

خوای گەورە کاتێك (نوح) (سەلامی خوای لێبێت) لە بارەی کوڕەکەیەوە قسەی لەگەڵ کرد، پێی فەرموو: ﴿قَالَ يَـٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَـٰلِحٍ﴾ هود: ٤٦.

واتە: (ئەو کوڕەت لە خێزانی تۆ نییە، ئەوە کردەوەیەکی چاك نییە (ئەو داواکردنەت)).

ئەوەش (ئیبراهیم) (علیه السلام)، خوای گەورە هەموو پەیوەندییەکی نێوان ئەو و باوکی دەپچڕێنێت: ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ﴾ التوبة: ١١٤. واتە: (کاتێك (ئیبراهیم) زانی باوکی دوژمنی خوایە، ئیتر خۆی لێ بەری کرد).

ئەو کافرانەی دژایەتیمان ناکەن، لە ماڵ و شوێنی خۆمان دەرمان ناکەن، یا لەسەر پەیمان بن لەنێوانماندا ئەوا: بە دادپەروەرانە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین، بە باشە ڕووبەڕوویان دەبینەوە، بە چاکە لەگەڵیان دەبین، بەڵام نایخەینە جێی برا و خوشکە دینیەکانمان، دۆستمان نین و بەدڵ خۆشمان ناوێن، چونکە ئەوان باوەڕیان بە خوای میهرەبان نییە. (فتاوی علی الطنطاوي)

### ٣- پێوانەی خۆشەویستی بۆ خوا:

بزانە پێوانەی خۆشەویستی بۆ خوا یا لەبەر خوا، مانای ئەوەیە خەڵکیت خۆش بوێت بەپێی خۆشەویستی ئەوان بۆ خوا، واتە چەندە

ئەوان خوایان خۆشدەوێ و گوێڕایەڵن و فەرمانەکانی بەجێ دێنن بەو ئەندازە خۆشت بوێن. ڕقت لێیان بێت بە ئەندازەی دووریيان لەخواوە، لوتبەرزی بەرامبەر فەرمانەکانی و بەجێنەهێنانی.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (هەر کەسێك خۆشەویستی و ڕقی لەبەر خوا بوو، بەخشی لەبەر خوا و گرتییەوە لەبەر خوا، ئەوا ئیمانی کامڵ و تەواوە). رواه الطبراني.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: (لەبەندەکانی خوای گەورە کەسانێك هەن نە لە پەیامبەرانن، نە شەهیدان، بەڵام پەیامبەران و شەهیدان ئاواتەخوازی پێگە و جێگەکەیانن و کەیف خۆشن پێیان لە قیامەتدا لای خوا). وتیان: پێمان بڵێ ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: (ئەوانە قەومێکن (کۆمەڵە کەسێکن) یەکتریان خۆش ئەوێت لەبەر خوا، بێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی خوێن و خزمایەتی لەنێوانیاندا بێت، نە لەبەر ماڵ و سامان بێت بیدەن بەیەك، سوێند بە الله ڕوویان لە نور و ڕووناکییە و لەسەر نور و ڕووناکین، هیچ بیم و ترسیان نییە کاتێك خەڵکی دەترسن. دڵتەنگ نین و خەمیان نییە کاتێك خەڵکی لە خەمدان، (خەم لە ڕابردوو ترس لە داهاتوو). (أبوداود)

ئەمانە دۆست و خۆشەویستی خوان، دۆست و خۆشەویستی خوا نەترسیان لەسەرە، نە خەمیان هەیە.

لەبەرئەوە لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە: ﴿وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلاًّ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ خوایەگیان دڵەکانمان هیچ ڕق و کینەیەکی تیانەبێت بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە.

پێویستە دوورکەوینەوە لە هەر شتێك دووری و بۆشایی بخاتە نێوانمان، یەکێ لە پیاوچاکان دەفەرموێت: با هاوکار و دەستباری یەکتربین بۆ ئەو شتانەی کۆکین لەسەری، پۆزش بۆ یەکتر بێنینەوە لەو شتانەی کۆك نین و ڕێك ناکەوین لەسەری.

## ٤- ئایا هاوڕێکەم منی فرۆشت؟

هیچ نامۆ نییە لە زۆربەی کچان ئەم پرسیارە ببیستین، چەندە کچان هەن ساڵەهایە هاوڕێن و دواتر کۆتاییەکەی بەم پرسیارە سەردەردێنن: ئایا هاوڕێکەم منی فرۆشت؟ لەوانەیە هاوڕێیەك سەرەتا دڵنەوات بێت، لە ئازارەکانت کەم بکاتەوە، گوێ بۆ خەمەکانت بگرێت، دواتر لە پڕ دەگۆڕێت، وەفای نییە بۆت، هیچ گوێ نادات بەگلەیی و هەستەکانت، پەیوەندی پێوە دەکەیت وەڵامت ناداتەوە، قسەی بۆ دەکەیت گوێت پێ نادات. لەم کاتەدا کچە لەم جەفا و بێ مەیلییەی هاوڕێکەی ئازار دەچێژێ و شەوان لە خەفەتدا خەوێ لێ ناکەوێت، تووشی خەمۆکی و تێکشکان دەبێت، کوا ئەو هاوڕێیەی هەموو هەستەکانی دڵم بۆ دەردەبڕی؟ کوا ئەوەی لەپاش خوا ئەوم هەبوو کە

هاودەم و پشتیوانم بێت؟ هۆکاری ئەم دڵڕەقی و لالووتییەی چییە دوای ئەو هەموو خۆشەویستی و خوشکایەتییە؟! لێرەدا دەڵێین:

لەوانەیە خۆشەویستییەکە بۆ بەرژەوەندییەکی دونیایی بووبێت، یا ئارەزوویەکی تایبەت، یاخود هاوڕێیەتییەکە لەسەر بنەمای خۆشەویستی بۆ الله دروست نەبووبێت.. یا لەوانەیە هۆکارەکەی زیادەڕەویی بووبێت لە خۆشەویستی بەرامبەر هاوڕێکەت، هاوسەنگ نەبووبیت.

یاخود باوەڕت وابووە هاوڕێکەت ئیتر موڵکی تۆیە و هیچ غەمی نییە جگە لەتۆ!!

## ٥- ئەی چارەسەر چییە؟

(محمد رشید عوید) لە کتێبی (لحظات یا بنات)، چەند ڕێگایەکی چارەسەری داناوە بۆ ئەم حاڵەتە:

**یەکەم:** پێویستە خۆشەویستی نێوان خوشکان بۆ خوا بێت، دەبێت کچان ئەوە بزانن خۆشەویستی بەهرەیەکە لەخواوە، ئەگەر بەڕاست و بێ ڕیا بوو، ئەوا پاداشتی دەستدەکەوێت، وەك ئەو فەرموودەیەی (پێشتر ئاماژەمان پێکرد)، پێگە و جێگەیان ئەوەندە بەرزە پەیامبەران و شەهیدەکان خۆزگەیان پێ دەخوازن و کەیفخۆشن پێیان.

**دووەم:** ئەوە ڕاستە ئیسلام داوای خۆشەویستیمان لێدەکات و لەبەر خوا یەکمان خۆش بوێت (وەك ئەو فەرموودانەی ئاماژەمان پێدا)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەم ئیسلامەیە داوای میانڕەویمان لێدەکات،

بۆیە نابێ لەمەشدا نە زیادەڕۆیی بکەین نە تیژپەڕی، وا مەزانە کە تۆ هاوڕێکەت بەم جۆرە خۆشدەوێت، ئیتر ئەو کەسیتری خۆشناوێ و گرنگی بە کەسییتر نادات جگە لەتۆ، لەوانەیە هەر ئەم ڕەفتارەی تۆ تەنگی پێ هەڵچنیبێت کە تۆ ویستبێت هەموو هاوڕێیەتی و خۆشەویستییەکە قۆرخی بکەی بەس بۆ خۆت.

**سێیەم:** بەو ڕەفتارانەتدا بچۆرەوە کە لەگەڵ هاوڕێکەتدا هەت بووە، لەوانەیە هەر ئەو شێوازی ڕەفتارە ئەوی گۆڕی بێت و بێزار بووبێت.

پێویستە هەروەك چۆن دەتەوێت ئەو گوێت بۆ بگرێ و گرنگی بە هەستەکانت بدات، تۆش بەو شێوە گوێی بۆ بگریت و گرنگی پێ بدەیت.

بهێڵە ئەویش باسی خۆی بکات، بزانە چ کێشە و قسە و باسێکی هەیە با دەری ببڕێت، خۆت بگرە تا ئەویش غەمەکانی خۆی بەبا بدات، زۆر پەیوەندی پێوە مەکە، کە کردیشت درێژەی مەدەرێ با قەڵس و بێزار نەبێت لێت.

**چوارەم:** پەیوەندیت لەگەڵ خوای خۆت بەهێزبکە، خۆشەویستیت تەنها لەبەر خوابێت، خوای پەروەردگارت خۆش بوێت، کاتێك بوویتە خۆشەویستی خوا، خۆشەویستت دەکات لای فریشتەکان و تەواوی خەڵکی.

زۆربەی کێشە و ئاریشەکان هۆکارەکەی لە کەموکوڕی ئیمان و پاشەکشە لە عیبادەتە، ئەگەر هەر خوشکێك کاتێك کێشەیەك ڕووبەڕووی دەبێتەوە، یا تووشی دڵگرانی و خەمێك دەبێت، خێرا

دەستنوێژێك بگرێت و بچێتە سەر بەرماڵەکەی و سوجدەیەك بۆ خوا بەرێت، بە خۆیدا بچێتەوە و لەو هەڵسوکەوتەی بەرامبەر خوا و خەڵك کردوویەتی، ئەوا هەموو کاروبارەکان ئاسایی دەبنەوە و باش دەبن.

دەگێڕنەوە یەکێك لە پێشینە چاکەکان کە لەماڵ دەچێتە دەرەوە نەفامێك جنێوێکی زۆر ناشرینی پێ دەدات، خێرا دەگەڕێتەوە ماڵەوە دوو ڕکعات نوێژ دەکات و لە سوجدەکەیدا دەڵێت: خوایە لەو تاوانەم خۆشبە کە ئەم کابرای هاندا بەسەرما تا جنێوم پێ بدات).

پێشینە چاکەکان هەر کات خراپە و خەمێك ڕووبەڕوویان بووبێتەوە، خێرا بەخۆیاندا چوونەتەوە لەبری سەرزەنشتی بەرامبەر، هەستیان وابووە تاوانێکیان کردووە و سەرپێچی فەرمانی خوایان کردووە وەها تووشی خراپەبوون.

تۆش ئەگەر خوشکەکەت گۆڕاوە بەرامبەرت، فەرامۆشی کردوویت و سۆز و خۆشەویستی بۆت نەماوە، بگەڕێرەوە بۆلای خوا، دواتر بۆ نەفسی خۆت و باشی بکە.

**پێنجەم:** واز لە خوشکەکەت مەهێنە گەر ئەو وازی لێهێنایت، خۆت گێل مەکە لێی کاتێك ئەو خۆی لێ گێل کردی، وێنەی ئەو پێگە و پاداشتە بێتە پێش چاوت کە بۆ ئەو کەسانەیە یەکتریان لەبەر خوا خۆشدەوێت.

ئارام بگرە لەسەر ئەو ڕەفتارەی، خۆت ڕابێنە لەسەری، بەخۆت بڵێ: ئەمە کاری خوایە کە ئاوا گۆڕاوە بەرامبەرم، بۆئەوەی بگەڕێمەوە بۆلای خوا و دەروونم پاك بکەمەوە لە دووریم لە پەروەردگار و غافڵ

بوونم. ئەگەر هەندێك کەس دنەیان دایت و وتیان: (ئارامگرتنیش سنوری هەیە، ئیتر تەواو دان بەخۆداگرتن و بەسە ئارامگرتن)، دڵخۆشی خۆت بەوە بەرەوە ئەو پیاوەی دێتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، سکاڵای حاڵی خۆی دەکات لە دەست خزم و دۆستانی، دەڵێ من سەردانیان دەکەم، بەڵام ئەوان هەموو پەیوەندییەکی خزمایەتییان لەگەڵم پچڕاندووە و نایەنە لام، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ: (ئەگەر تۆ وابیت کە دەڵێیت ئەوا وەك خۆڵەمێش سوکت کردوون (یا شەرمەندەت کردوون)، تا تۆ وەها لەسەر ئەمەبیت کە باست کرد ئەوا خوا لەگەڵتە و پشتیوانتە). رواه مسلم.

کۆڵ مەدە و بەردەوام بە لەسەر خوشکایەتییەکەت، ئەو خۆشەویستییەی خوشکەکەت لەگەڵت دروستی کردووە عەیبداری مەکە، چەمکی خوشکایەتی بە شیرینی و جوانی دەمێنێتەوە ئەگەر چی لەلایەن هەندێك بشێوێنرێت. بیرت نەچێت ئەگەر خۆشویستن لەبەر خوا ڕاستەقینە بێت، هیچ کات جەفا (لالووتی) کاری تێ ناکات، نە بەکەمی پەیوەندی و هاموشۆ، نە بە نەبوونی دیاری و بەخشش، لەناو دەچێت.

لەوانەیە هەندێك لە خوشکانت لەو خۆشەویستییەی نێوانیان شیرینی ئیمانیان نەچەشتبێت، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مژدەی پێ دەدات: (سێ شت لە هەر کەسێکدا بێت، شیرینی ئیمان دەچەژێت، خوا و پێغەمبەری خوا لە هەموو کەس لەلای خۆشەویستربن، هەر کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت، و پێی ناخۆش

بێت بگەڕێتەوە سەر بێباوەڕی وەك چۆن پێی ناخۆشە بکرێتە ئاگرەوە)
متفق علیه.

هۆکاری ئەمەش ئەوەیە ئەو خوشکە لەبیری خۆیدا یەکسەر باز دەداتە سەر دووهەم (أن يحب المرء...)، بیری دەچێت خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری خوا لە پێشترە، کاتێك خۆشەویستی ئەو دووانە چووە دڵیەوە، ئەوا هەموو ئەوانیتر بۆی ئاسان دەبێت، ئەمجا ئەگەر ئەمە چووە دڵیەوە و بەدوایدا خۆشەویستی خوشکێکی چاك بوو، ئەوا هەست بە شیرینی ئیمان دەکات، دڵی تێر بووە لە ئەوین هەمووی بۆ خوایە، نەك لەبەر پلە و پایە و کەسێکی تایبەت.

شەشەم: وا گومان مەبە کە بنەمای خوشکایەتی و برایەتی پەیوەندی ڕۆژانە و هەواڵ پرسینی یەکترییە، وەك ئەوەی ئەم خوشکە شتێکی تەرخانکراو بێت بۆ ئەو و هیچ ئیش و کار و بەرپرسیارێتییەکی نییە لە ئەو زیاتر، ئێمە لەکوێی ڕەفتاری پێشینە چاکەکانداین، کاتێك لە (ئیمام مەیمون کوڕی میهران) دەپرسن: فلان کەم دێتە دیدەنیت! لە وەڵامدا دەڵێت کاتێك دۆستی و خۆشەویستی لە دڵدا جێگیربوو، کێشە نییە گەر نەهاتنی درێژە بخایەنێت.

یەکێکیتر بە هاوڕێکەی وت: سوێند بەخوا حەزەکەم هەموو ڕۆژێك بتبینم و سەردانت بکەن، بەڵام دەترسم ناڕەحەتت بکەم.

براکەی لە وەڵامدا دەڵێ: برامان هەیە ئەگەرچی دوورن لێمان، بەڵام نزیکترن بە دڵەکانمان لەوانەی هەموو ڕۆژێك دەیانبینین.

ئەوان ئەمە نەریتیان بووە، ئێمەش سەرزەنشتی یەك دەكەین لەسەر كەمی سەردان كردن و كەمی دۆستایەتی، ئیمامی شافیعی دەفەرموێت: (من صدق في أخوه أخيه قبل عليه، وسدخله، وعفا عن الله).

هەر كەسێك ڕاستگۆ بوو لە برایەتی (خوشكایەتی)یەكەی، ئەوا پاساوەكانی قبوڵ دەكات، كەموكوڕییەكانی دادەپۆشێ و لە هەڵەكانی خۆش دەبێت).

## ٦- خۆشەویستی خوێندكاری كچ بۆ مامۆستاكەی:

هەندێك لە كچان سەرسامن بە مامۆستا ئافرەتەكەیان و لە ڕادەبەدەر خۆشی دەوێت، دەیكاتە نموونەی بەرزی ژیانی و هەموو وزە و سۆزی بۆ ئەوە. لەم كاتەدا پێویستە مامۆستاكە هەوڵ بدات ئەم پەیوەندییە ڕاستكاتەوە و بەپێی بنەمای شەرع ڕێكی بخات. پێویستە خوێندكارەكانی فێری شكۆ و سەربلندی بكات، ئەو سۆز و غەریزەیان دامركێنێتەوە، بەڕۆچوون لە عیبادەت و پەناگرتن بەخوا، یەكلابوونەوە بۆ فێربوون و خوێندنەوە، یا ئەو هونەرەی حەزی پێ دەكات، وەك وێنەكێشانی دیمەنی سروشتی... هتد).

## ٧- هاوڕێیەتی لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە

بێگومان ئەو هاوڕێیەتی لێرەوە دروست دەبێت خەیاڵ ڕۆڵێكی گرنگی تێدا دەبینێت، كاتێك گوێبیستی دەنگی كەسێك دەبی لە ڕێی

تەلەفۆنەوە، دەربڕینی دەموچاو و زمانی جەستەی نابینی، ناتوانی حوکم بەیت لەسەری بەدروستی، چونکە دەنگەکەی زاڵ بووە بەسەر هەستەوەرتدا، چونکە ئەو لەڕێگای یەك هەستەوەرەوە کە (گوێ)یە سەودات لەگەڵ دەکات، باقی هەستەوەرەکانییتر نین لە کاردا.

ئەگەر پەیامبەری خوا بەو گەورەیەی بفەرموێت: (بێگومان من مرۆڤم، ئێوە شەڕ و ناکۆکییەکانتان دێننە لام، لەوانەیە لەو کاتەدا هەندێکتان بەڵگە و سەلماندنی کێشەکەی زیاتر خستبێتە ڕوو، من دادوەری بەپێی ئەوە دەکەم کە دەیبیستم، هەر کەسێك دادوەریم کردبێت بەسەر مافی براکەیدا، ئەوا پارچەیەك لە ئاگرم بۆپچڕیوە) (متفق علیه).

ئیتر چۆن دەتوانین بە بیستن ڕاستگۆیی ئەو کەسانەمان بۆ دەردەکەوێت یا درۆکردنیان، کە زۆر ئاسانە ترش و خۆێی زیاتری پێوە بکرێ و خۆشە بکرێت؟!

یاخود چۆن ئەم کەسە نەبینیت و نە دەنگیشی دڵنیای کە کێیە، ئایا دەتوانی پەیوەندی لەگەڵ ببەستی؟ بە چ پێوەرێك؟ تەنانەت ئەگەر لەڕێی کامێرایشەوە بێت پەیوەندییەکە، چۆن ئەم کارە لە دەرەوەی چوارچێوەی شەرع دەکەیت؟! بێگومان کەس ڕێگریت لێ ناکات لەوەی پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵ کچان ببەستی، بەڵام یەکەمجار دەبێت ئەو هاوڕێیەتییە لەگەڵ دۆست و هاوڕێ نزیکەکانت بێت کە دەیانناسیت، چۆن متمانە دەکەیت لەڕێی نێتەوە پەیوەندی لەگەڵ کچێکدا ببەستی کە نە دەیناسیت، نە هیچ زانیارییەکت لەسەری

هەیە، کێ نالێ ئەو وێنانەی تۆ لەڕێی هاوڕێیەتییەوە بۆی دەنێریت سبەی پێشانی پیاوی نەناسی نادات، یا بڵاوی ناکاتەوە؟!

بە خراپ بەکارتبێنن و ناوت بە خراپە بزڕێنن، یاخود لەبەر ئەو وێنانەی کەوتۆتە دەستییان و تۆ بە سادەیی و دڵپاکی بۆت ناردوون، دەستەمۆت ناکەن و هەرچی خراپەیە پێت ناکەن (کە لەم ساڵانەدا زۆر ڕوویداوە)، ئاگاداربە خوشکەکەم لەو پەیوەندییانەی لەڕێی ئینتەرنێتەوە دەبەستریێت، ئەمە گێلی و نەزانیتە، دەتخەنە داوەوەو دەرئەنجامی باش نابێت، بەرەو هەڵدێرت دەبات کە قەرەبووی قورسە!



# وەرزی هەشتەم تۆ و کوڕە گەنجەکان

زۆرجار ڕێك دەکەوێت کچ لە بازاڕدا گەنجێك ببینێت، یا لە دەرگای قوتابخانەکەیدا.. یاخود لەڕێی تەلەفون و مۆبایلەوە گوێی لە دەنگی دەبێت..

لەم کاتەدا گوێبیستی قسەی خۆش و شیرینکراو دەبێت، سوێندی بۆ دەخوات کە خۆشەویستییەکەی پاکە بەرامبەری، یا دەست دەنێت بە مەسجێکدا و بۆی دەنێرێت کە پڕیەتی لە مانای عیشق و دێوانەیی.. بەڵێن و خەیاڵی بێبنەما کە ئەم هاوسەری ئایندەیەتی و سوارچاکی خەونەکانی!!

## ١- ئایا ئەم گەنجە چی لێت دەوێت؟!

پێویستە ئەم کچە لە خۆی بپرسێت: ئەم کوڕە چی دەوێت؟! ئایا ئەوەی دەیەوێت شەهوەت و ئارەزووی حەرام نییە؟ جارێکیتر بپرسەرەوە لەخۆت: چۆن دڵنیایی لەکوڕێك لەخۆتەوە متمانەی پێ دەکەیت، لە کاتێك ئەو ناپاکی بەرامبەر خوا و دینەکەی دەکات و پەیوەندی نامەشروع و حەرام دەبەستێت؟!

ئایا نەتدیوە و نەتبیستووە چەندەها کچ چەندە پەشیمانبوون لەم جۆرە پەیوەندییانە. کە ئاوات دەخوازن ئەو کەسەیان هەر نەناسیایە و هەرگیز بە هاوڕێ قبوڵیان نەکردایە؟!

بەبیرت دێنمەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لِلْإِنسَـٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾﴾ الفرقان: ٢٨ — ٢٩.

واتە: (خۆزگە فلأن کەسم نەکردایەتە هاوەڵ و دۆستی خۆم، بەڕاستی وێڵی کردم لە بەرنامەی خوا دوای ئەوەی کە پێم ڕاگەیەنرابوو، بێگومان شەیتان هەمیشە و بەردەوام هۆی خەجاڵەتی و شەرمەزاری ئادەمیزادە).

## ٢- بەراورد بکە لەنێوان ئەم دوو دیمەنەدا:

دیمەنی یەکەم: گەنجێکی ڕاستی پارێزکار لەسەر تاعەت و گوێڕایەڵی، کاتەکانی بۆ پەرستشی خوا دەستەبەر کردووە، گەنجێتی لە تاعەت و گوێڕایەڵی پەروەردگار دەباتە سەر. کاتێك فیتنە و تاوان دەخرێتە بەرچاوی، چاوی لێ دادەخات و نەزەر ناکات، خۆی لێ لادەدات، خۆ ئەمیش وەك هەر گەنجێکیتر ئارەزوو و مەیلی هەیە، بەڵام دەزانێت دەبێت لە چوارچێوەی شەرعدا بێت، کاتێك کچێك دێتە بەردەمی قسەی لەگەڵ بکات، ڕووی وەردەگێڕێت و دەڵێ: ﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ رَبِّىٓ أَحْسَنَ مَثْوَاىَ﴾ یوسف: ٢٣.

واتە: (پەنا دەگرم بەخوا، پەروەردگار دەرووی لێ کردوومەتەوە و مێردەکەشت چاك ڕەفتاری کردووە لەگەڵم).

دیمەنی دووەم: وێنەی کوڕێکی لار و سەرگەردان و بەرەڵڵا چاوی لەسەر حەرام لانادات، لەبەر ئارەزوو شەهوەتدا خۆی پێ ڕاناگیرێت. ڕۆژانە کاتی بێ هودە لە بازاڕدا بەسەر دەبات.. لەکوێ ئافرەتی لێیە لەوێ یە و تەماشای ئەم کچ و شوێنکەوتنی ئەو ئافرەت. شەوەکەشی بە تەلەفون و تەماشای فیلم و کەناڵە بێڕەوشتییەکان.

دەی تو خوا کامیان شایانترە پێی سەرسام بیت و جێی وەسف و سەنایە؟!

ئەو گەنجەی بەسەر ئارەزووەکانیدا زاڵ دەبێت لەبەر ڕەزامەندی خوا و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی؟ یان ئەو گەنجەی لەبەردەم ئارەزوو و شەهوەتەکانی ئەژنۆی دەشکێ و خۆی پێ ڕاناگیرێت، دەیەوێت لەسەر تێکدانی ئەخلاق و لەناوبردنی بەها و پاك داوێنی دەستی کەوێت.

### ٣- تەلەفون و هاوسەرگیری:

هەرگیز باوەڕ مەکە هاوسەرگیری لەڕێگای تەلەفونێکی گاڵتەوە دروست ببێت، تەنانەت ئەگەریش سەر بگرێت زۆرینەیان چارەنووسیان شکست و لێك هەڵوەشان و گومان و پەشیمانی دەبێت. هەرگیز باوەڕ مەکە گەنجێك ئەگەرچی پاك و دڵسۆز و ڕاستگۆ خۆی دەرخات، ڕێز لە کچێك بگرێت ناپاکی بە خێزان و کەسوکارەکەی بکات، لەگەڵ ئەم بە مۆبایل شەو و ڕۆژ قسە بکات.

چەندەها کچ گریاون و خۆیان لەناوبرد، بەهۆی ئەو کوڕانەی دەستی (٢٠) کچی وەك ئەمیان بڕیوە و پێیان ڕابواردوون و دواتریش وازیان لێهێناون: ئەمانە چەندە دوورن لە ئەمەك و وەفاوە، گوێ بە هیچ هەستێکی بەرامبەر نادەن، کاتێك کاری خۆیان تەواوبوو کەسێکی تریان دۆزییەوە.

## ٤- بەڵێنە درۆینەکان:

ئایا دەزانی ئەو گەنجە هەرچەندە بەڵێنی زۆر و قەبە بدات دواتر دەچێتەوە بەخۆیدا و دەڵێ: ئەم کچە کاتێك ئاوا خۆی دەخاتە بەردەستی من، بۆ ساتێکیش بێت لە ژیانیدا بۆ کەسیتریش وادەکات؟! بەڵێ، ئەمە سیفەتی ئەو گەنجە دوور لە دین و بێ نرخانەیە، بەڵام واقعێکە و هەیە، ناتوانێ لێی ڕابکا، کە تێر پێی ڕابوارد و هەرچی ئارەزووی بوو کردی و کچ بەو بەڵێنە درۆیانە باوەڕی کرد و خەڵەتا، بەو شێوە وازی لێ دێنێ و هەرگیز بۆ هاوسەری هەمیشەیی قبوڵی ناکات، ئەمە ئەو واقیعەیە کە بە کچان دەڵێ: بە ئاگابن و فریو مەخۆن بەو بەڵێنە درۆینانە.

پسپۆڕێکی دەروونی و کۆمەڵناسی لەبارەی خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری کە ئێستا زۆری دەیبیستین و قسە و باسی لێوە دەکرێت، دەڵێت: لەو بارەدا کوڕ حەز بە خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری دەکات، تا بە حەز و ویستی خۆی ڕابوێرێت و کەیف و خۆشی بکات، دواتر هاوسەرگیری بڕیاری بەدەستی ئەمە، با کچ هەر داواکات بیەوێت

وازی لێ دێنێ و وەك جلە كۆنێك فڕێی دەدات! دەچێت كچێك هەڵدەبژێرێت بۆ زەواج دڵ و نامووسی پاراستبێت و ڕادەستی هیچ كەسێكی نەكردبێت، وەك گوڵێك تازە پشكوێت، نەكەس بۆنی كردبێت نە تەپوتۆزی لێ نیشتبێت!! هەمیشە با مێینەتی خۆتت لەبیربێت، پاك داوێنی و سەربەرزیت لەبەرچاو بگرە و لەبیری مەكە، بەدەستی خۆت خۆت مەخە چاڵی سوكێتی و سەرشۆڕییەوە.

### ٥- مرۆڤە گورگ ئاساكان:

ڕاستە هەمیشە پیاو هەنگاوی یەكەم دەنێت بۆ ڕێی تاوان. هەرگیز ئافرەت یەكەم هەنگاو نانێت، بەڵام ئەگەر كەشەكە لەبار نەبێت و ڕەزامەندی ئافرەت نەبێ، دەستپێشخەری ناكات و هەنگاو نانێت، ئەوە (ئافرەتە)كە دەرگا دەكاتەوە و بە دزە دەڵێ: فەرموو، كاتێكیش دزییەكەی لێ دەكرێت ئەمجا هاوار دەكات خەڵكینە فریام كەون دزرام!!

ئەگەرچی گورگ لە مەڕ هیچی ناوێ گۆشتەكەی نەبێت، ئەوەی ئەو كوڕە لەتۆی دەوێت زۆر بەنرخترە لە گۆشت، خراپترە لە مردن بۆت، ئەو مردنەی مەڕەكە بە دەست گورگەكەوە دەیچێژێت.. ئەو بەنرخترین و خۆشەویسترین شتی لێت دەوێت كە (پاكیزە)یتە، ئەو پاك داوێنیەكەی سەربەرزی پێی و شانازی پێوە دەكەیت و پێی دەژیت.

ژیانی ئەو کچەکەی، پیاوێک - بەهۆی نەهێشتنی پاکیزەییەوە - نوقمی غەم و پەژارەی دەکات سەدان جار لەو مردنە بەسۆترە کە مەڕەکە بەدەست گورگەکەوە و خواردنی گۆشتەکەیەوە دەیچەژێت.

هیچ کات باوەڕ مەکە بە قسەی هەندێک پیاو کە دەڵێن: هیچمان لەکچ ناوێت ڕەوشت و ئاکاری نەبێت. ئەوان وەک هاودەمێک قسەی لەگەڵ دەکەن و وەک هاوڕێیەک دۆستایەتی دەکەن، ئیتر ڕەوشتی چی، والله درۆیە هەمووی!! ئەگەر دەزانن کوڕەکان لەناو خۆیاندا چیتان پێ دەڵێن؟! ئەو کوڕە دوور لە دین و شەرعانەی مەبەستیان گاڵتەپێکردنە بە ناموستان، دەڵێن: هەر پێکەنینێکت بەدەمەوە کرد و قسەیەکی خۆشت بۆ کرد، یا خزمەتێکت کرد، ئیتر ئامادە و سازە، هەرچیت بوێ پێی بکە؟! ئەمە ئەوانە وا تەماشای تۆ دەکەن، تۆ قبوڵتە؟!

بەشدارن لە خۆشی و لەزەتێکی کاتی، ئەو (کوڕەکە) زوو بیری دەچێت، ئەوە تۆی کچیت کە تاماویت دەبێ خەمەکەی بچێژیت، ئەو زوو دەڕوات بەلای پەیداکردنی کەسێکی تری بێ ئاگا، تا چارەنووسی وەک تۆ لێ بکات، ئابڕووی بەرێت، تۆیش لەوانەیە تەنها نەمانی پاکیزەیی نەبێ، بەڵکوو کارەساتی گەورەتری لێ بکەوێتەوە، ئەو پەیوەندییە ناشەرعییە کە مۆرێکی ڕەش بێت بە نێو چاوانتەوە.

کۆمەڵگەی زاڵم لە کوڕە خۆش دەبێ و دەڵێن: گەنجێک بوو گومڕا بوو دواتر تۆبەی کرد! ئەوە تۆی لە تاڵاوی سەرشۆڕیدا تا ماویت دەمێنیتەوە و کۆمەڵگە هەرگیز لێت خۆش نابێت.

ئەگەر تۆ کاتێك کوڕێکی وا نەفس نزم هاتە ڕێت، چاوت لێ لاداو دوو قسەت پێ وت، ئەگەریش هەر وازی نەهێنا پێڵاوی بۆ داکەنی و بیدەی بەسەر و چاویا، ئەوا کەس بوێری نەبوو لێت نزیك بێتەوە، بەڵکوو دەستەودامێنت دەبوو و تۆبەی دەکرد و مەمنوونت بوو بتخوازێت، نەك ئەوەی دوای تۆ کچانیتر بەدبەخت بکات.

### ٦- سەرسامبوون بە یاریزانە وەرزشییەکان:

لەکچان هەن لەکاتی وانەبێژیدا مۆڵەت وەردەگرن بۆئەوەی بچن تەماشای یاری تۆپی پێ کەن، یا دەپرسن لەوەی چ تیپێك براوە بووە؟ هەیانە شیفتە و سەرسامە بە یاریزانێك، یا تیپێکی تۆپی پێی دیاریکراو.

ئایا چ گرنگییەکی هەیە بۆی بردنەوەی تیپێك بەسەر ئەویتردا، یا ژمارەی گۆڵەکان کە تیپێك کردوویەتی؟!

ئەم خەڵکە چ بەرهەمێکی چنیوەتەوە لەم خۆ سوورکردنەوە و لایەنگیرییە لەم یاریزان و تیپانە؟! ئەی ئایا کچێك چی دەستگیر دەبێت لەمە لە بەهەدەردانی کات زیاتر و یاریکردن بە هەست و سۆزی؟ هەروەها یاخی بوون لە سروشتی مێینەتی و دایکایەتی...؟

***

## ٧- کچان و کەوتنە داوی کوڕان:

کوڕان داو دەنێننەوە بۆ کچان و بە هەر شێوەیەک بێت سەرنجیان ڕادەکێشن بۆ خستنە نێو ئەو داوە، بە چەند وشەیەک بێت یا تەماشاکردنەکانی، یا بە پێدانی ژمارەی مۆبایلەکەی بێت.

ئەمە بۆتە دیاردە و لەنێوان کوڕان و کچاندا، وەک ئاگری ناو پووش بڵاوبۆتەوە و پەرەی سەندووە.

دەبینن لەسەر شەقام یا لە ترافیکلایتێکدا ئۆتۆمبیلی کچێك وەستاوە، کوڕێك بە ئۆتۆمبێلەکەی دێتە پەنای و جامەکەی دێنێتە خوارەوە و پارچە کاغەزێك دەداتە ئۆتۆمبێلەکەی پاڵی، ئەمە دیمەنێکە ڕۆژانە لەپێش چاومان ڕوودەدەن بێ هیچ شەرم و حەیایەك. بزانە ئەم کاردانەوە و داونانەوەی کوڕان بۆ کچان گەورەترین ئامڕازی فەساد و بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتییە، یەکێکە لە هۆکارەکانی دارمانی خێزان زایەکردنی داهاتووی کچان، چەندان کچ شوێن داو و تەڵەی ئەم کوڕانە کەوتوون و دەرگای خۆشبەختییان بەڕووی خۆیاندا داخستووە، تەنانەت بەناو زڕاندنی یەك کچیان کچانی تری خێزانەکەش چارەڕەش دەبن و کەس ناچێت بەسەر وەختیانەوە.

چەندان ئافرەتی هاوسەردار کەوتۆتە ئەم داوەوە و مێردەی پێیزانیوە لێی جیابۆتەوە، مناڵەکانی سەرگەردان و زایەبوون.

هەرکەس بەدواداچوون بکات بۆ لێکەوتەکانی ئەم کارەساتە، ئەم بەدڕەوشتییە، ئاهوحەسرەت دەخوات بۆ دۆخی کچانی موسڵمان، دەزانێت ئەم داونانەوە هۆکارێکە بۆ فریودان، تۆڕی ڕاوکردن بۆ کردنە

نیشانەی نامووسیان و ڕسواکردنیان، دواتر وەك قوربانییەك لە سوچێکدا فڕێیان دەدەن و وازیان لێ دێنن. یا دەبنە لەشفرۆش و لادەر، وەك مۆریانە جەستەی ئەم ئوممەتە دادەڕزێنن.

بێگومان هەریەك لە کوڕان کچان، بە چەند ڕێگایەك نواندن و فێڵ و فڕ بەکاردێنن بۆ لەخشتە بردن و خستنە داوی کەسی بەرامبەر! بە خەمزەیەکی چاو، یا زەردەخەنەیەکی ژەهراوی، زوڵفێکی پەرێشان لەنجە و لار و خۆبادانێك لەڕێ ڕۆشتندا، یاخود عەترێکی تیژ، ئەوە با بووەستێت تەلەفۆن و مەسیج تەڵەیەکی بەهێز بۆ نێچیرەکانیان و.. دواتر دەستپێکردنی گەشتی تاوان و خەشم و قینی خوا.

بەتایبەت ئێستا کە هەموو ئامڕاز و هۆکارێك هەیە، لەبەردەست منداڵ و هەرزەکار و گەنج و لاو لە کوڕ و کچ بۆ کارئاسانی ئەو کارانە.

بەڵام ئایا ئاکامی چی دەبێت؟! ئایا تەنها لەزەتێکی کاتی نییە، چێژێکی کەم خایەن و گوناهێکی کوشندە! تەماشاکەن یەکێك لەو کچانەی قوربانی ئەم کارە خراپەیە چۆن باسی لەو نەهامەتییە دەکات بەسەریدا هاتووە!

(سەرەتا تەلەفونێکی ئاسایی.. پەرەی سەند بۆ چیرۆکی خۆشەویستییەکی بێ بنەما و خەیاڵی، ئەو منی خەڵەتاند کە دەتهێنم و هاوسەرگیریت لەگەڵ دەکەم، داوای کرد بمبینێت، قایل نەبووم. هەڕەشەی کرد کە وازم لێ دێنێت، پەیوەندیم لەگەڵ دەپچڕێت، وێنەیەکی خۆم و نامەیەکی پڕ لە سۆزم بۆ نارد. نامە و قسەکردنم لەگەڵی لەڕێی تەلەفۆنەوە بەردەوام بوون، ئەو قسەکانمی ڕیکۆرد

کردبوو، بۆ ئەوەی بیکاتە هۆکارێک بۆ هەڕەشە لێکردنم و بڵاوکردنەوەیان، لە ترسی ئەوە چوومە دەرەوە لەگەڵی، بەو بەڵێنەی کە پێی دابووم ساتێکی کەم بێت و درێژە نەخایەنێت تا من زوو بگەڕێمەوە!! گەڕامەوە..

بەڵام خۆزگە هەر نەچوومایەتە دەرەوە، خۆزگە هەر بەڵێنم نەدایە، چوومە دەرەوە، بەڵام بە نەنگی و سەرشۆڕی گەڕامەوە، زۆر تکام لێکرد لێی پاڕامەوە کە هاوسەرگیریم لەگەڵ بکات و لەم ئابڕووچوونە ڕزگارم بکات! بەڵام دەزانن وەڵامەکەی چی بوو؟!!

بە گاڵتەپێکردن و سوکایەتییەکی زۆرەوە پێی وتم: من ئافرەتێکی بەدکار و داوێنپیس ناخوازم و بیکەمە هاوسەری خۆم! بەم شێوە بەو چارەنووسە ڕەشەوە بەجێی هێڵام، ئەم ماوە و داهاتوویەکی تاریک، ئەویش ڕۆشت تا بەدوای نێچیرێکی تردا بگەڕێت و بیکاتە ناو چڵکاوەوە.

### ٨- بۆچی ئەم دیاردەیە بەم شێوە فراوانە بڵاوبۆتەوە؟

ئەمڕۆ زۆربەی گەنج پەیوەندییان لەگەڵ خوای پەروەردگار نییە تا بیانگێڕێتەوە لە گوناهو تاوان، نە عیبادەتێکە سەرگەرمییان بکات، نە زیکر و ویردێکە و نە قورئانخوێنێك ببێتە هاودەم و خەمڕەوێنی تەنهاییەکەی، بێگومان کاتێك پشتی لەخواکرد، شەیتان دەبێتە هاوەڵ و سەرداری. دەچێتە سەر وەختی ئەو شتە حەرامانەی بیکاتە هاودەمی خۆی و کاتەکانی پێ پڕ بکاتەوە، بەتاڵی و بێکاری گەنج

مەترسیدارە، ئەگەر بە شتێك یان كارێكی بەسود پڕ نەكرێتەوە كە تەنها ئیسلام چارەسەری دەكات، ئەو موسڵمانە كە دەترسێت لەوەی سات بە سات و چركە بە چركەی ژیانی بەهەدەر نەدات و بەشتی هیچ و پووچ پڕی نەكاتەوە، تەنانەت وشەیەكیش بێت، چونكە دەزانێت لێپرسینەوەی لەسەر دەكرێت: (وفراغك قبل شغلك) بەتاڵییەكەت چۆن بەسەر برد؟

## ٩- ئاگاداری كامێرای مۆبایلەكان بە:

كچێكی ڕەوشتبەرز و پاك لە زانكۆ، دوای وانەكانی ماندووە لەسەر یەكێ لە كورسییەكان پاڵی داوەتەوە، لەگەڵ هاوڕێ كچەكانیدا گوێی بەوە نەداوە قاچ و شتی داپۆشێت، بەڵام پیلانەكە لێرەدایە، كچێكی خراپ بۆ گێچەڵ كامێرای مۆبایلەكەی دەكاتەوە و بێ ئەوەی ئافرەتەكە خۆی بزانێت وێنەی دەگرێت، دواتر دەچێت لە ئینتەرنێت بەهەموو لایەكدا بڵاوی دەكاتەوە. ئایا باوك، برا، هاوسەر و خێزانەكەی دوای بڵاوبوونەوەی ئەم وێنەیە بەم شێوە ناپۆشتە، دانیشتنێكی نادروست، چی بكەن؟! لە كاتێكدا ئافرەتەكە بێ ئاگا و پاك و بێ تاوان؟!

هەر بەم چركەی كامێرایە چەندەها ماڵ داڕماون، لەخوا بترسە خوشكەكەم، هیچ كات وێنەی كچ لە میمۆری مۆبایلەكەت هەڵمەگرە، وێنەی ئافرەت مەگرە لە شایی و ئاهەنگەكاندا و دواتر نیشانی كەسانی تری بدەیت، یاخود بینێریت بۆ ئەملاولا!

(دکتۆر ئیبراهیم محمد فاین) شارەزا لە (فیقهی تاوانکاری)، دەڵێت: (تێکڕای زانایان هاوڕان لەسەر حەرامی تەماشاکردنی (عورت)ی خەڵکی، ئایا بە بینینی ڕاستەوخۆ بێت، یان لە کونی دەرگا و دیوار و پەنجەرەوە بێت، یا لەناو ئاودا بێت، لە گوناهە گەورەکان هەژماریان کردووە، تەنانەت هەر کون و کەلەبەرێك ماڵە دراوسێی لێوە دیاربێت، یا پەنجەرەیەك ماڵەکەت لە دەرەوە دیاربێت لێوەی، قەدەغەیە و حەرامیان کردووە.

حوکمی وێنەگرتن بە کامێرای مۆبایل، یا هەر کامێرایەکی تر بە دزییەوە، ئایا ئەو ئافرەتە لەناو بازاڕ و سەرشەقامدا بێت، یا لە هۆڵی ئاهەنگ، یا لەناو ئۆتۆمبێل، لە سەیرانگاکان، ئەمانە هەمووی حەرامن، وەك حوکمی تەماشاکردنە لە سەربان و پەنجەرە و دەرگا و دەلاقەی ماڵانەوە، بگرە وێنەگرتنە کارەساتبارترە و زیانی زیاترە، چونکە دەمێنێتەوە لەلای و دەتوانن لەڕێی ئینتەرنێتەوە بڵاوی بکەنەوە.

## ١٠- فیلمێکی ڤیدیۆیی ژیانی وێران کرد:

ئەمە چیرۆکی کچێکی زانکۆیە کە بە ڕەوشتبەرزی و ئەدەب و حەیا ناسرابوو، دەڵێت: ڕۆژێك کاتێك لە زانکۆ چوومە دەرەوە گەنجێکی جوانخاس هاتە بەردەمم، تەماشای کردم وەك ئەوەی بمناسێت، هیچ گرنگیم پێی نەدا و ڕۆشتم، کەوتە شوێنم و بە دەنگێکی نزم قسەی دەکرد (کچە شۆخە جوانەکە، من ئەمەوێت هاوسەرگیریت لەگەڵ بکەم، چەند وەختە چاودێریت دەکەم ماوەیەکە دەتناسم. دەزانم ڕەوشت و

ئاكارت چۆنە). منیش هەنگاوەکانم خێرا کرد و عارەق بە نێو چاوانمدا دەهاتە خوارەوە، هیچ کات ڕووبەڕووی وەها هەڵوێستێك نەبووبوومەوە، گەشتمە ماڵەوە بە ترس و لەرزەوە، شەوەکەی هەر خەو نەچووە چاوانم ئەوەندە شپرزە و نائارام بووم.

ڕۆژی دواتریش هەر بە هەمان شێوە لەبەردەم دەرگای زانکۆ وەستابوو، بە ڕوومدا پێکەنی، ئەم کاردانەوە و کەوتنە شوێن و بەردەوام تا بەنامەیەك کاری خۆی کرد، فڕێیدایە بەر دەرگای ماڵەوە، دوودڵ بووم هەڵیگرم، بەڵام هەڵمگرت، هەردوو دەستم دەلەرزی، خوێندمەوە پڕبوو لە وشەی عیشق و خۆشەویستی و دێوانەیی، داوای لێبوردنی کردبوو کە قەڵسی کردووم بە ڕەفتارەکانی.

کاغەزەکەم دڕاند، دوای چەند سەعاتێك زەنگی تەلەفون لێیدا هەر ئەو گەنجە بوو، وتی نامەکەت خوێندەوە؟! وتم ئەگەر واز نەهێنی و عاقڵ نەبی بە خێزانەکەم دەڵێم تەمبێت بکەن، دوای چەند کاژێرێك دووبارە تەلەفۆنی کردەوە، پێی وتم کە مەبەستی پاکە و ئەو دەیەوێت هاوسەرگیری بکات و دابمەزرێت. هەرچیت بوێت بۆت دەکەم، من لە خێزانەکەم تەنها ماومەتەوە و کەسم نییە .. وو ..

دڵم بۆی نەرم بوو، منیش قسەم بۆ دەکرد، چاوەڕێی تەلەفونی دەبووم، دەچوومە دەرەوە لەگەڵی و بە ئۆتۆمبێلەکەی تەواوی شارەکە دەگەڕاین، ئیتر هەستمکرد ئیرادەم لەدەستداوە و ناتوانم بیربکەمەوە، سەرمەستانە قسەکانی باوەڕدەکرد، کاتێك دەیگوت تۆ

تاکە کەسی ژیانمی دەبێتە هاوسەرم، لە ژێر یەك سەقفدا ژیان بەسەر دەبەین کە تیایدا بەختەوەری و خۆشی سەراپای بگرێتەوە.

ڕۆژێك، ئای چ ڕۆژێك.. ڕۆژێکی ڕەش.. هەموو ژیانمی وێران کرد، داهاتووی فەوتاندم.. وەك ڕۆژانیتر لەگەڵی چوومە دەرەوە، بردمی بۆ شوققەیەك، چوومە ژوورەوە و پێکەوە دانیشتین، فەرموودەکەی پێغەمبەرم (صلی الله علیه وسلم) لەیادکردبوو: (با هیچ پیاو و ئافرەتێکی بێگانە (نامەحرەم) بەتەنها نەبن، هەتا مەحرەمێکیان لەگەڵ نەبێت). رواه مسلم.

شەیتان دڵی داگیرکردبووم، دڵم پڕبوو لە قسەی ئەم کوڕە و هیچی تر، نووقمی سزای دۆزەخ بووین، کاتێك زانیم نێچیریکم لە دەست ئەم کوڕەدا، بەنرخترین شتێك کە هەمبوو لەدەستم دا!!

وەکوو شێت هەستامە سەر پێ و وتم چیت کرد؟! وتی مەترسە تۆ هاوسەری منی.

وتم: چۆن بێ مارە بڕین من ژنی تۆم؟!

وتی: بەزوویی مارەت دەکەم.

گێژ گێژ گەڕامەوە بۆماڵەوە، سەرم سوڕی دەخوارد، خوایەگیان من چیم کرد؟ هەموو دونیا لەبەرچاوم تاریك بوو، دەستمکرد بە گریان، زۆر گریام.. وازم لە زانکۆ هێنا، تا بێت خراپتر دەبووم، ماڵەوە هیچیان نەزانیبوو، هەموو هیوا و ئاواتێکم ئەوەبوو کە بەڵێنی دابوو بمخوازێت، ڕۆژان دەڕۆیشت و ڕۆژێکی بەدوای خۆیدا دەبرد، وامدەزانی دونیا بەسەر شانی منەوەیە، دوای ئەوە چی ڕوویدا؟! ئەو شتە لەناکاوەی

هەموو ژیانمی وێران کرد، زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا، ئەوبوو وتی: دەمەوێت بۆ مەسەلەیەکی گرنگ بتبینم، لە خۆشیا ڕۆشتم، وامدەزانی بۆ ڕێکخستنی کاروباری زەماوەندەکەمانە ئەم کارە گرنگە!!

یەکترمان بینی، زۆر بە توندی قسەی دەکرد، پێش ئەوەی من هیچ بڵێم وتی: هەرگیز بیر لە هاوسەرگیریمان مەکەرەوە، ئەمەوێت هەروا بەیەکەوە بین بێ هیچ مەرج و عەقدێك.

دەستم بەرزکردەوە بێ هیچ هەستێك، زللەیەکم لێدا، بڵێسە لە چاوەکانی دەهاتە دەرەوە، وتم: من وامزانی هاتووی هەڵەکەت چاك بکەیت، بەڵام هیچم نەدی پیاوێکی بێ بەهای بێڕەوشت نەبێت! لە ئۆتۆمبێلەکەی دابەزیم و بە گریانەوە ڕۆشتم: بانگی کردم: دەقەیەك بێ زەحمەت، ئاوڕم دایەوە، کاسێتێکی ڤیدیۆیی بەدەستەوەبوو بەبێباکانە وتی: بەم کاسێتە تێکت دەشکێنم.

وتم چی لەناودایە ئەو کاسێتە؟

وتی: وەرە لەگەڵم تەماشای کە بزانە چی تێدایە، ڕۆشتم بزانم چییە؟! کە بینیم فیلمی هەموو ئەوەی لەنێوانماندا ڕوویدابوو تیایدا تۆمارکرابوو.

وتم: چیت کردووە ترسنۆك، بێنرخ؟! وتی: کامێرا شاراوەکان بەسەرمانەوەبوون، هەموو چرپە و جوڵەیەکیان گرتووە. ئەم کاسێتە چەکێکە لەدەستمدا تا ژیانتی پێ وێران بکەم، یا دەبێت هەرچیم وت ئەوە بکەیت، بەیەك ئاماژە فەرمانم بەجێ بێنیت. هیچم لەدەست نەهات گریان نەبێت، چونکە ئیتر ئەوە پرسێکی من نەبوو بە تەنها، هی

هەموو خێزانەکەم و بنەماڵەکەمان بوو، دەرئەمجام وابوو، بوومە یەخسیری، دیلێك بووم لە دەستیدا، لەم پیاو دەیدامە ئەو پیاو و پارەی وەردەگرت کەوتمە گێژاوەوە.. ژیانم بووە بێئابڕوویی. خێزانەکەشم هیچیان نەزانیبوو، تا ئەو ساتەش متمانەی تەواویان پێم هەبوو.

گرتە ڤیدیۆییەکە بڵاوبوویەوە، کەوتە دەست کوڕی مامەکەم و مەسەلەکە تەقییەوە، باوکم و هەموو خێزانەکەم زانییان، ئەو ئابڕووچوونە بە هەموو شارەکەدا بڵاوبوویەوە، خێزانەکەمان لەکەداربوو، ڕامکرد تا خۆم ڕزگار بکەم و ون بم لە چاوی خەڵکی، دواتر زانیم کە باوکم و براکانم چوون بۆ وڵاتێکیتر.

بڕیارم دا تۆڵەی خۆم بکەمەوە، ڕۆژێکیان هات بۆلام زۆر مەست و سەرخۆش بوو، فرسەتم هێنا چەند چەقۆیەکم لێدا، ئەو ئیبلیسەم کوشت کە لەبەرگی مرۆڤدا بوو خەڵکیم ڕزگارکرد لە خراپەکارییەکانی، چارەنووسی من ئەوەبوو لە پشتی میلی زیندانەکاندا خۆم بینییەوە، تاڵاوی سەرشۆڕیم دەنۆشی، پەشیمان بووم لەو کارە خراپانەی ئەمجامم دابوون، ئەو خراپە و بێ ئابڕووییەی بەسەر خۆمدا هێنابووم ئەم چیرۆکەی خۆمم نووسییەوە تا ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ هەموو ئەو کچانەی بەدوای قسەی باق و بریق و نامەی ڕازاوە و عیشقی درۆینەدا دەڕۆن.

❋❋❋

## ١١- نامەیەك لە كچێكەوە:

ئەمەش كچێكی ترە كە كوڕێك فریوی دەدات و نامووس و دڵی بەتاڵان دەبات، كۆرپەیەك لە سكیدا جێدێڵێت، دواتریش وازی لێدێنێ دەڕوات و لای لێ ناكاتەوە، دوای چەند ساڵێك نامەیەكی بۆ دەنووسێت، نامەیەك كە كاری تێدەكات، بەڵام پاش چی، پاش ئەوەی كات بەسەرچووە.. كچەكە لە نامەكەیدا دەڵێت:

" تۆ كاتێك منت جێهێشت دەتزانی لە هەناومدا كۆرپەلەیەك هەیە گیانی تێدایە و دەجوڵێت، بەڵام هیچ گرنگیت بەمەنەدا، گوێت پێ نەدا، تاوەكوو بارێك نەخەیتە سەر خۆت كە بینینی نەگبەت و بەدبەختێكە تۆ خاوەنی بێت، ئایا دوای ئەوە ئەتوانم باوەڕت پێ بكەم و وەك پیاوێكی بەشەرەف لێت بڕوانم؟ نەخێر، تەنانەت ناتوانم بە مرۆڤیشت دابنێم، تۆ درۆت لەگەڵ كردم كە وتت خۆشت دەوێم! تۆ كەست خۆش ناوێت جگە لە خۆت، ناپاكیت لەگەڵ كردم، وتت دەتخوازم، بەڵام بەڵێنەكەت نەبردەسەر و وتت: من كەسێكی تاوانباری داوێن پیس ناخوازم!! ئەو تاوانەی من بە دەستی تۆ بوو، ئەگەر تۆ نەبوویتایە من نە تاوانباربووم و نە داوێن پیس! تۆ پاكیزەیی منت دزی، بە تاڵانت برد، منت سەرشۆڕ و ڕسواكرد، دڵمت وێران كرد و بۆ هەتایە غەمبارت كردم، ئایا چ خۆشییەك و چێژێك لە ژیاندایە، كاتێك بۆ ئەبەد نەتوانم ببمە هاوسەری پیاوێك و دایكی منداڵێك، بەڵكوو هەر نەتوانم تەنانەت لە كۆمەڵگاكەشمدا بژیم؟ تۆ ژیانی منت وێران كرد، چونكە من لە خێزانەكەم ڕامكرد، تۆ دایك و باوكی منت كوشت، بەڵێ، بكوژی

ئەوانی، چونکە لە خەم و خەفەتی لە دەستدانی من مردن، من ئەم نامەم نووسیوە تا پەیمانت لەگەڵ تازەکەمەوە و تۆ زۆر لەوە کەمتری، من تا ئێستا سەرم لەگۆڕ دەلەرزێ، دەمەوێ لە ژیانماڵئاوایی بکەم، ئەم نامەیەم نووسی تا پێت بڵێم تۆ لەلای من بارمتە و سپاردەیەکت هەیە، ئەویش کچەکەتە، ئەگەر سۆز و میهر لە دڵدا نەماوە سا بەڵکوو سۆزی باوکایەتیت بجوڵێت و هیچ نا تۆزێ ئەو میهرەت مابێت و بێیت بیبەیتەوە، وەریبگرە و بیبەرەوە لای خۆت تا لەو کلۆڵی و نەگبەتییەی ئاگادار نەبێت کە دایکی پێشتر دەیزانی".

## ١٢- لەخۆت بپرسە:

پرسیارێکت لێدەکەم: ئایا پێنج فەرزە لەبەردەم خوای (رب العالمین)دا دەوەستیت نوێژەکانت ئەمجام بدەیت، پەیوەندی ناشەرعیشت بە کوڕەوە هەبێت؟!

ئایا قورئانی پیرۆز (کتاب الله) دەکەیتەوە و بیخوێنیت، لەسەر ئەو پەیوەندییەش بەردەوام بیت؟، ئایا ڕۆژوو دەگریت و هەر دۆستایەتیت نەپچڕاندووە؟، دەی بیر لەم ئایەتە پیرۆزە بکەرەوە:

﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَـٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾﴾ طه.

واتە: (ئەوەی ڕوو وەرگێڕێت لە بەرنامە و یادی خوا و پشتی تێ بکات، ئەوا ژیانی تاڵ و ناخۆشیان هەیە و لە قیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین، لەو کاتەدا دەڵێ: خوایە تۆ بە کوێری حەشرم دەکەی، خۆ من کاتی خۆی چاوساغ بووم، لە وەڵامدا دەفەرموێت: تۆ کوێر و نابینا بوویت کاتێك ئایەت و بەڵگەکانی ئێمەت پێ ڕاگەیەنرا، ئێمەش ئەمڕۆ ئاوا دەتخەینە پشت گوێ و فەرامۆشت دەکەین).

ئەو وتەیە وەبیر خۆت بێنەوە کە دەڵێن:

(ئەوەی نافەرمانی خوا بکات و پێبکەنێ، دەچێتە ئاگرەوە بە گریانەوە).

بۆ بیرناکەیتەوە کاتێك تەماشای ئەو پیرەژنە ئەکەی ئێسقانەکانی شل بوون هیچ هێزی نەماوە، ئەویش گەنجێکی بەتوانا و چوست و چالاك بووە وەك تۆ، بەڵام بەخێرایی ساڵەکان دەڕۆن و گوڵی گەنجێتی هەڵدەوەرێت، لەجێیدا لاوازی و بێ توانایی جێی دەگرێتەوە!!

ئەی چۆن ئەو گەنجێتی و وزە و توانات بەهەدەر دەدەیت؟ ئایا نەتبیستووە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(حەوت دەستە هەن لە قیامەتدا لەژێر سێبەری عەرشی خوای پەروەردگاردان، لەو ڕۆژەدا کە هیچ سایە و سێبەرێك نییە، هی پەروەردگار نەبێت) لەنێو ئەو حەوت دەستەدا:

( گەنجێك لە تاعەتی خوا گەنجێتی بردبێتە سەر و پێگەیی بێت و گەورە بووبێت). رواه البخاري.

بێگومان مەبەستی فەرموودەکە (ژن و پیاوە). ئەم بەڵێنە بۆ چ کاتێکە؟ ئەم ناز و نیعمەتە بۆ کەیە؟ ئەو ڕۆژەیە کە هەموو بەندەکان (دروستکراوەکان) کۆبوونەتەوە، خۆر یەك میل لەسەریانەوە دوورە، عارەقەیان پێوانەی ٧٠ باڵ دەچێ بە زەویدا، لەتاو بڵێسەی گەرما، جا عارەقەکەیان بەرز دەبێتەوە، هەندێکیان تا لای قوللە پێی دێ، هەندێکیان تا ئەژنۆی، هەیانە تا ئەژنۆی دێت، هەشیانە تا بینەقاقای تێدەچەقێت!!

دەبیربکەرەوە لەو ڕۆژە سەختە تاقەت پڕووکێنەدا لەو کەسانە بیت لەژێر عەرشی خوادا بی و سایە و سێبەرت عەرش بێ کە هیچ سێبەرێکی تر نییە پەنای بۆ بەرن.



# وەرزی نۆهەم
## وریابە لە تێکەڵی نامەحرەم

دڵنیابە ئەوانەی کچان هەڵدەنێن بۆ بەناو ئازادی و سەربەستی، شکاندنی بەربەستەکانیان، هەوڵ دەدەن تێکەڵیان بکەن کە هیچ بەربەستێکی دینی نەبێت و بەهیچ بەهایەکەوە نەبەسرابێتەوە! ئەوە تەنها بۆ ئەوەیە کە وایان لێبکەن ئاسان بن بەدەستەوە، بیکەنە دۆست و پێی ڕابوێرن بۆ چەند ساتێك، دواتریش فڕێیدەنە سەر جادە، هەروەك چۆن پاشماوەی خۆراکەکەیان فڕێ دەدەن، کاتێکیش دێنە سەر هاوسەرگیری، سورن لەسەرئەوەی لەگەڵ ئافرەتێکی پاك داوێنی ڕەوشتبەرزی ڕاستدا هاوسەرگیری بکەن، چونکە باش ئافرەتە ناپاکەکان دەناسن!!

هەموو ئەو ئیدیعایانە بەدرۆخرانەوە کە دەیانوت تێکەڵاوی و نەبوونی بەربەست لەنێوان ژن و پیاودا، مەیلی جنسی دەشکێنێت و غەریزە دادەمرکێنێتەوە بۆ درۆ و بەتاڵی ئەم قسەیە، هەر کەسێك بە وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکادا تێبپەڕێت پەی پێدەبات کە لە درۆ و دەلەسەیەکی هەڵخەڵەتێنەر نەبێت هیچیتر نییە.

هەر بە ئاگابوون لە بارودۆخی ئەو وڵاتانە تێدەگەیت کە تێکەڵی، ئاگری شەهوەت و ئارەزووی زیاتر بڵێسەدار کردووە، فەساد و بەڕەڵایی گەیاندۆتە لوتکە، نموونەی وەك ئەو تینووە وایە لە ئاوی دەریا بخواتەوە تا بیخواتەوە زیاتر تینوی دەبێ و تێر ئاو نابێ.

## ١- ئایا کەسی بە غیرەت ماوە پەرۆشی نامووسی بێت؟

دوو کەڵەشێر کاتێك لەسەر مریشکێك کۆدەبنەوە دەیکەنە شەڕ بۆ ئیرەیی لێی و پاراستنی غیرەتی دەجووڵێت، تەماشاکە لە کەناری دەریای وڵاتە عەرەبییەکاندا پیاوی بەناو موسڵمان هیچ غیرەیەکیان لەسەر ژنەکانیان نییە بێگانە و نامەحرەم بیانبینێت، ئەوەش نەك تەنها دەست و دەموچاویان، بەڵکوو هەموو شتێکیان!!

لە یانە و ئاهەنگی شەوانەدا پیاوی بەناو موسڵمان ژنەکانیان دەدەنە دەست پیاوی بێگانە سەمای لەگەڵ بکات، (چونکە بە پێشکەوتوو ڕاقی) دادەنێن، لە زانکۆکاندا کچان و کوڕان (بە حساب موسڵمانن و لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدان)، بە ڕووتی و جلی ناپۆشتەوە لەگەڵ یەك دانیشتوون، نە باوك و نە دایکە موسڵمانەکانیان ناڕازی دەردەبڕن و نە ڕێگرییان لێ دەکەن!!

تەوقەکردن لەگەڵ یەکدا و پیاسەکردن و پێکەوە سەعیکردن و.. هتد، ئیتر هیچ بیریان نییە خوا بە جیاواز دروستیکردوون ئەم کچە و ئەو کوڕە! تیایاندا مەیلی بۆ یەکتر خەلقکردووە، نە ئەو و نە ئەم و نە هەموو خەڵکی سەرزەوی، ناتوانێت ئەم دروستکراوەی خوای گەورە

بگۆڕێت یا دەستکاری بکات، ئەو هەست و مەیلەی پیاو و ژن بەرامبەر یەك هەیانە لەناوبەرێت و بیسڕێتەوە. بانگخوازانی یەکسانی و تێکەڵاوی بەناوی شارستانی و پێشکەوتنەوە، هیچیان ناوێت ڕابواردن و تێرکردنی ئارەزووەکانیان نەبێت، بەڵام بوێری ئەوەیان نییە بە ئاشکرا و بێ پەردە ئەمە بڵێن، لەناو ئەم بڕ و بیانووانەدا پەردەپۆشی دەکەن و لە بەرگێکی تردا دەیخەنە ڕوو. بەم دەستەواژە و وشە باقوبریقانە:

پێشکەوتن، شارستانی و مەدەنییەت، هونەر، ژیانی کۆمەڵایەتی، ژیانی زانکۆ، ڕۆحی وەرزشی، دەڵێن تێکەڵاوی شەهوەت دەشکێنێت، ڕەوشت و هەڵسوکەوت ڕێکدەخات، ئەو مەیل و دێوانەییە لەڕووی جنسەوە (سێکس)ەوە هەیە لایدەبات، بەڵام ڕاستییەکە ڕێك پێچەوانەی ئەم قسانەیە.

## ٢- تینووی شوێنکەوتنی داب و نەریتی ڕۆژئاوا:

پیاوانی غەرب زەدە دەیانەوێت نەریتی ڕۆژئاوا بەسەر ژناندا بسەپێنن، بەهەموو بێڕەوشتی و فەسادێکییەوە - کە دینی پیرۆزی ئیسلام هەڵمان دەنێت بۆ پاراستنیان - دوورخستنەوەیان لە ڕێگای ڕاست، لە کاتێکدا خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە و کتێبە ئاسمانییەکانی بۆ ڕووناککردنەوەی دابەزاندووە و بانگەوازی خەڵك بۆ ئەو ڕێگا ڕاستە.

ئەوان دەیانەوێت ئافرەتی موسڵمان شوێن هەموو نەریتی ئافرەتی ڕۆژئاوا بکەوێت، بست بە بست باڵ بە باڵ، وەك چۆن فەرموودەی

پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) وێنای کردووە بۆمان، هەتا دەیکەن بە کونی بزنمژەکەدا.

ئەم نموونەی کونی بزنمژە (قوم قومە) بۆئەوەیە شوێنێکی تەنگ و پێچاو پێچ و بۆن پیسە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ژنی ڕۆژئاوا چووە ناوی ئەمانیش کە شوێنیان کەوتوون، دەچن با بەو جۆرە تەنگەلان و ناخۆشیش بێت!! ئەمانە بێئاگان لەو مەینەتییەی ئەمڕۆ ژنانی ڕۆژئاوای تێکەوتووە و پێوەی دەناڵێنن، ئەو تێکەڵییە بێ سنور و بێ مەرجە، چی بەدوای خۆیدا هێناوە؟!

ئەو چارەنووسە ڕەشەی بەهۆیەوە ژن و پیاو و خێزانەکان تێی کەوتوون، بەڵکوو تێکڕای کۆمەڵگە، ئەمانە گوێی خۆیان ئاخنیوە لەو هەموو هاوار و ناڵە و نارەزایەتییەی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا، لە نووسینی زانا و نووسەرەکانیان، ترسی بیرمەندەکانیان لەو بێ بەندوبارییەی بەهۆی تێکەڵی نێر و مێ، ئەخلاق و شارستانییەتییان خستۆتە مەترسییەوە، هەروەها ئەم تینووانە بە نەریتی سەقەتی ڕۆژئاوا بیریان چووە کە هەموو ئوممەت و قەومێك کەسێتی و بیروباوەڕ و کلتور و تێڕوانینی خۆی هەیە بۆ گەردوون و ژیان و بوون و خوای خاوەنی بوون، بەها و کەلەپور و سامانی نیشتمانی و دابونەریتەکانی، ڕێگا نادەن ببێتە کۆپی کۆمەڵگەیەکیتر.

❋❋❋

### ٣- پیاو و ژنی نامەحرەم پێکەوە لەماڵەکاندا:

(دکتۆر محمد بن لطفی الصباغ) دەڵێت: ئەمڕۆ ئەوەی لەناو خێزانەکاندا باوە، هێنانی خزمەتکارە بۆ کاروباری ماڵەکانیان، بە جۆرێك شەو و ڕۆژ لە ناو ماڵەکاندا دەمێننەوە و نووستن و خۆشووشتن.. هتد، ئەم خزمەتکارانە پیاوبن یان ژن مادام شەو و ڕۆژ لە ماڵ دەمێننەوە لەڕووی شەرعەوە کێشەیە، (لێرەدا باسەکە باسی ئافرەتە و بۆیە باس لە خزمەتکارە پیاوەکان دەکەین).

کاتێك پیاو بۆ کاروباری خۆی دەبێ بچێتە دەرەوە، هاوسەرەکەی جێ دێلێت لەگەڵ خزمەتکارێکی پیاو (کە زۆرینەیان لەسەر دینی ئیسلام نین)، ئەم خزمەتکارە بێگومان گەنجێکی چوست و چالاکە، ئافرەتەکەش قورسە بۆی خۆی بپێچێتەوە لەناو ماڵدا و هیچ کوێی دیارنەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا بانگی خزمەتکارەکە دەکات کاری پێدەکات و دەیبات و دەیهێنێت، شەیتانیش نەخەوتووە لەگەڵ خوێن بە دەمارەکانماندا دێت و دەچێت، هەر پیاو و ئافرەتێك بە تەنها پێکەوە کۆببوونەوە سێهەمیان شەیتانە، یەکتریان لا جوان و خۆشەویست دەکات تا دەیانخاتە تاوانەوە.

زۆرجار وایە ئەم خزمەتکارە جوانخاس و شۆخە، لەوانەیە هاوسەری ئافرەتەکە بە تەمەن و ناحەز بێت، یا خراپ و شەڕەنگێز و تورە، ئەی ئەبێ دەرەنجامی ئەم پێکەوەبوونە چی بێت ئەگەر ترسی خوا زاڵ نەبێت بەسەریاندا؟ ئەوەتا قورئانی پیرۆز بەسەرهاتی حەزرەتی یوسف دەگێڕێتەوە (سەلامی خوای لێبێت)، کاتێك لە ماڵی (عزیز)دا دەبێت،

چۆن ڕووبەڕووی فیتنە و فریو دەبێتەوە: ﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَ﴾ یوسف: ٢٣.

واتە: ( زوڵەیخا هەوڵی دا لە خشتەی بەرێت و تووشی گوناهی بکات، هەموو قاپییەکانی داخست و وتی: من خۆم بۆ تۆ ئامادەکردووە و شێت و شەیدای تۆم).

بەڵام یوسف سەلامی خوای لێبێت لەم کاتەدا لەگەڵ ژنێکدا بەتەنهایە و ئەوپەڕی خۆی بۆ ڕازاندبوویەوە، فەرمووی: (پەنا دەگرم بەخوا) بۆیە خوای گەورەش پاراستی لەو تاوانە گەورە، خۆ ئەگەر لەو کاتە ئیمانەکەی قایم نەبوایە و نەیوتایە پەنا دەگرم بەخوا، ئەوا فیتنە و بەڵایەکی گەورەی تووش دەبوو.

هەروەك ئەوەی لەناو شوێنکەوتەکانی ڕۆژئاوا و دارودەستەیانەوە بڵاوە، ئەوانەی ترسی خوا لە دڵیاندا نییە، خۆیان لە حەرامەکان ناگرنەوە، دەبینی ئافرەت پێشوازی لە هاوڕێی مێردەکەی دەکات، کاتێك مێردەکەی لە ماڵەوە نییە ڕێ دەدەن بە پیاوی بێگانە (نامەحرەم) بێتە ماڵیان دانیشتن لەگەڵ یەك، قسە و گاڵتەوگەپ لەگەڵ یەك..

ئەم جۆرە خەڵوەتە قەدەغەیە و ڕێ پێنەدراوە لە شەرعدا، هیچ کات شیاو نییە کەمتەرخەمی تێدا بکرێت، بەبیانووی ئەوەی بڵێن متمانەمان بە هاوسەرەکەم هەیە یا بە هاوڕێکەم! لەمەش خراپتر ئەوەیە ئافرەتەکە بە تەنها و بێ مەحرەم سەفەر بکات، لەگەڵ

شۆفێرەکەی یا خزمەتکارەکەی، هەروەها چوونی بۆلای پزیشکێکی پیاو بەتەنها، لێرەدا خەڵوەی ڕێ پێنەدراو دێتە ئاراوە.

هاوچەشنی ئەمانە، ئەوەی کە هەندێك پیاو هاوسەر و کچەکانی لەگەڵ شۆفێرێك دەنێرێت بۆ هەر کوێ دەیانەوێت، کە لەناو ئەو ئۆتۆمبێلەدا کەس نازانێت چ قسەیەك ئاڵوگۆڕ دەکرێ و چ کارێك دەگوزەرێت، خوای گەورە نەبێت.

هەروەها میوانی و کۆبوونەوە خێزانییەکان کە تێیدا ژن و پیاو پێکەوە دادەنیشن و لە کاتێکدا خۆیان ڕازاندۆتەوە و پۆشاکی شەرعی ناپارێزن، حیجابیان دەکەنەوە و جوانییەکانیان دەردەخەن، بەبیانووی ئەوەی هاوڕێن و تێکەڵی یەکن، ئەوەی ڕەچاو ناکرێت لەم میوانیانەدا شەرعە، قسەی نابەجێ، گاڵتەوگەپی ئاست نزم، هەموو ئەو شتانەی دین بەشیاوی نازانێ و قەدەغەی لێ دەکات، ئەم هەڵسوکەوتانەیە گیانی خێزان دەڕووخێنێت، خۆشەویستی و دۆستی نێوان ژن و پیاو دەکاتە ڕق لە یەکبوون و ناپاکی.

چۆن پیاوی لەخواترس ڕازییە بەوەی ژن و کچەکەی لەگەڵ پیاوی بێگانە و نامەحرەم کۆببنەوە، یاخود سەفەر بکەن؟!

بەڵێ، ئافرەت مافی کارکردنی هەیە، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەری: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَ﴾ النساء: ٣٢.

واتە: (پیاوان ماف و بەشیان هەیە لەوەی کە بە دەستی دەهێنن، ژنانیش ماف و بەشیان هەیە لەوەی کە بەدەستی دەهێنن).

بەڵام ئەم کارکردنە مەرجە لە چوارچێوەی شەرعدا بێت، تێکەڵاوی تێدانەبێت، خەڵوەی تیا نەبێت، ئەم کارە بەرەو فیتنە و ناپاکی نەبات، کارەکەی بۆ پیاوان نەبێت تا قسە و پەیوەندی لێببێتەوە، لەسەروو ئەمانەشەوە پێویستە پابەندبێت بە پۆشتەیی و حیجابی شەرعی.



# وەرزی دەیەم خۆشەویستی ڕاستەقینە

## ١- چۆن مامەڵە لەگەڵ خۆشەویستی بکەین؟!

باوەڕ مەکە بەو قسانەی ئازادیخوازانی ئافرەت دەیڵێنەوە، گوایە پێویستە پێش پرۆسەی هاوسەرگیری، خۆشەویستی بکرێت ئەگینا سەرکەوتوو نابێت.

ئەمە تەنها ئیدیعایەکی درۆیە و هیچیتر، چونکە خۆشەویستی ڕاستەقینە دوای زەواج بوونی هەیە.

کچێك لە (دکتۆر سعيد رمضان البوطي) دەپرسێت، خۆشەویستی چییە؟ چۆن مامەڵە بکەین لەگەڵ ئەو کەسەی خۆشمان دەوێت؟ دکتۆر (البوطي) لە وەڵامی ئەم کچەدا دەڵێت: (خۆشەویستی هەستێکی جوڵێنراو و، خرۆش و کاردانەوەیەکی خۆڕسکە، کردەیەکی ئیختیاری نییە بەدەست خۆت بێت، بۆیە پەیوەست نییە بە ئەحکامە شەرعییەکانەوە چ (حەرام یا واجب یا مەکروه).

خوای پەروەردگار پێت ناڵێت: کەست خۆش نەوێت، بەڵکوو دەفەرموێت: ئەگەر کەسێکت خۆشویست لامەدە و بەرەو حەرام مەڕۆ، خۆشەویستییەکەت با بۆ خوا بێت و پاداشتی دونیا و قیامەتی هەبێت.

هەروەها پێت نالێ: ڕقت لە کەس نەبێ، بەڵکوو دەفەرموێت: ئەگەر ڕقت لە کەسێك بوو زوڵمی لێ مەکە، ناوی مەزڕێنە، بە خراپە باسی مەکە، لەبەرخوا ڕقت لێی بێت.

بەڵام ئەو خۆشەویستییەی زۆر کات دەیبینین، گەنجێك سۆزی کچێك بەکاردێنێت بۆ فریودان و دەستەمۆکردنی، پاشان کە خواستی خۆی بە دەست هێنا وازی لێ دێنێ و دەچێ بەدوای یەکێکی تردا، هۆکاری ئەمە ئەوەیە ئەم کچ و کوڕە هەستی خۆشەویستییان لە خوێندنەوەی چیرۆکێکی ڕۆمانسییەوە لا دروست بووە، یا لە فیلمێکی سۆزدارییەوە، ئەمەش زۆر دوورە لە سۆز و خۆشەویستی ڕاستەقینە، بەڵکو سێکسێکی پەتییە، ئەم چیرۆك و فیلمانە ئەوانە فریو دەدات کە لە بەهاو نرخی خۆشەویستی نازانن، تا ئەویتر بەکار بێنێت بۆ ئارەزووەکانی خۆی، کاتێکیش بەدەستی هێنا بێگومان وازی لێ دێنێت.

کاتێك پیاو جیاوازی نەکرد لە نێوان سۆز و تامەزرۆیی ڕۆحی لەلایەك و مەیل و شەهوەتی سێکسی لەلایەکیتر، ئەوا دەچێتە ڕیزی ئاژەڵەوە.

ئایا نابینن و نابیستن ڕۆژانە چۆن کوڕان کچانی سادە و بێئاگا ڕاو دەکەن، بەو وشانەی خێرا دەبنە هەڵم و ماناکانیان دەبنە بڵقی سەرئاو، دوای ئەوەی نێچیرەکەیان بە ئاسانی کەوتە نێو تۆڕی وەهم و درۆیەك بەناوی (خۆشەویستی)، کام خۆشەویستی؟ تۆ چووزانی خۆشەویستی چییە؟! ئایا ئەوەی ئەمڕۆ هەیە ناودەنرێت خۆشەویستی؟ یا سێکس؟!.

## ٢- ئەوە خۆشەویستی نییە:

ئەوەی ناویان لێناوە خۆشەویستی، خۆشەویستی نییە، بەڵکوو (سێکس)ە لە بەرگی خۆشەویستییدا، کاتێك ئەو خۆشەویستییە ڕاستەقینەیە و بە مەبەستی هاوسەرگیرییە ئەوا لە ڕێگای ڕاستەوە لە دەرگای کچە دەدرێت و لە خێزانەکەی خوازبێنی دەکرێت، بەڵام ئەوەی وەك دز لەلاڕێوە چوو بۆی، تەنها بینین و قسەکردن و ڕابواردن و کات بەسەربردن پێی، ئەوا بێگومان تەنها مەبەست لێی (سێکس) تێرکردنی ئارەزووەکانییەتی.

ئەمە گورگێکی برسییە لەمەڵاسدایە بۆ نێچیرەکانی، کاتێك گۆشتەکەی دەستکەوت، بە پێست و ئێسقانەکەوە فڕێت دەدات، نە هەستی هەیە بۆت، نە سۆز و بەزەیی، لەلای ئەو لە خۆڵ بێ نرختری. جا دەرگاکەت داخە لە هاتنە ژوورەوەی دزەکان، تا گوڵی تەمەنت و گەنجێتیت هەڵنەوەرێنن و ئابڕو و پاکیزەییت نەڕفێنن، با گەر تۆی دەویٚ و مەبەستی زەواجە لە ڕێگای حەڵاڵەوە بێت، هیچ ڕێیەك خۆشبەختی و سەرفرازیت بۆ ناهێنێت ئەو ڕێگایە نەبێت. گەروانەبێت دوایی نە پەشیمانی دادت ئەدات، نە گریە و زاری ئابڕووت بۆ دێنێتەوە.

بزانە خوای گەورە ئایەتێکی دانەبەزاندووە تا حیکمەتەکەی لەگەڵی نەناردبێت و ڕوونی نەکردبێتەوە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾ النور: ٣١.

واتە: ( بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ چاویان داخەن (لە نامەحرەم)، داوێنی خۆیان بپارێزن).

﴿وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ النور: ٦٠.

واتە: (خۆیان بپارێزن و پۆشتەبن ئەوە چاکترە بۆیان، خوا بیسەر و زانایە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ﴾ الأحزاب: ٣٢.

واتە: (ئەگەر بە تەواوی ترسی خوا لە دڵ و دەروونتاندایە، قسەیەك بە ناسکی و شێوەیەك مەکەن، نەوەکوو ئەوەی دڵی نەخۆشە تەماع بچێتە دڵییەوە بەرامبەرتان).

ئێستا ئیتر چاوەکانت داخست، داوێنت پاراست، لەخوا ترسایت و دەنگت نەگۆڕی لەکاتی قسەکردن لەگەڵ پیاواندا، ئەمجا ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەبیر خۆت بێنەرەوە کە دەفەرموێ:

زینای چاو: نەزەرکردنە، زینای گوێ (بیستن)ە، زینای زمان (قسەکردن)ە، زینای دەست (تۆڵە و زەبر و زەنگە)، زینای قاچەکانت (ڕۆشتنە)، زینای دڵ (مەیل و نییەت)ە.

ئەگەر بەم ئەندامانەت کاری خراپت ئەنجامدا، ئەوە زینای ئەو ئەندامەت کردووە، ئاگاداربە و خێرا دەرگای شەیتان داخە، ئیتر لەنێوان ئەم زینایانە و زینای گەورەدا هەنگاوێکە.

کەواتە دەرگای حەوشە و بانەکەت قایم بکە، تا لێیەوە دزە نەکەنە ژوورەوە و گوڵی تەمەنت بدزن و تافی لاویێتیت بە تالآن بەرن، ئابڕو و پاکێتیت بڕفێنن، لە بری ئەوە کۆڵێك غەم و پەژارە و مەینەتیت بدەنێ، یا ئازار و سەرشۆڕی، باش بزانە زۆرجار شیرینی و خۆشی ساتێك، ساڵەها خەفەت و ناڕەحەتیت بۆ جێدەهێڵێت.

ئەگەر ئەو کوڕە بەڕاستی تۆی دەوێت، دەچێت لە دەرگای ماڵە باوانت دەدات و لەوێ داخوازیت دەکات، ئەمەیە ڕێگا دروست و حەڵاڵەکە، هیچ ڕێگایەك خۆشبەخت و سەرفرازت ناکات ئەوە نەبێ.

پیاوچاکێك دەڵێت:

خۆشەویستی دڵ حەیران دەکات، کاتێك ئەو دڵە شەیدابوو، پەیوەست دەبێ و پەیوەست بوونەکەی وەك منداڵ وەهایە، دەلکێت بە شتی بێ نرخ و هیچ و بێ بایەخەوە، بەڵام کاتێك پەیوەست بوو بە (الله)وە ئەوا وەکوو پەیامبەران و پیاوچاکان و ڕاستگۆیان خۆشەویستییەکەی بە بەهاو بە نرخ دەبێت.

### ٣- بە پیاوانی بڕوادار بڵێ چاویان داخەن

ئایا هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەزانیت:

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا

وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ﴾ النور: ٣٠ – ٣١. واته: ( ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) بە پیاوانی بڕوادار بڵێ چاو بنوقێنن لە ئاست ژنانی نامەحرەمدا، وە داوێن و عەورەتیان بپارێزن، بێگومان ئەوە باشترە بۆیان، بێگومان خوا لە ئاکارەکانیان بەئاگایە، وە بە ژنانی باوەڕدار بڵێ: با چاویان داخەن لە ئاست تەماشای نامەحرەم و عەورەتیشیان بپارێزن لە گوناه، زینەت و جوانی و خشڵی خۆیان دەرنەخەن لە ئاستی نامەحرەم بێجگە ئەوەی لێی دەردەکەوێت، (وەك ئەوەی لە کاتی ئیش و کاردا دەست و دەم و چاو دەردەکەوێت)، با چمکی سەرپۆش و لەچکەکانیان بێننەوە بەسەر سنگ و ملیاندا تا سنگ و ملیان دەرنەکەوێت).

– (ابن أبی حاتم) بەم شێوەیە باس لە هۆکارەکەی دەکات. ئەسمای کچی مەرسەد باخە خورمایەکی هەبوو، ژنان دەهاتنە ناوی بێ ڕووپۆش (عەبا)، ئیتر قاچ و قول و خشڵەکانیان دەردەکەوت، (پاوانەکانیان) هەروەها سنگ و بەرۆکیان دیاربوو، ئەسماو وتی: چەندە ناشرین و نابەجێن، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ النور:٣١.

– (ئیبن مەردویە) لە ئیمامی عەلییەوە (کرم الله وجهە) بەم جۆرە باس لە هۆکاری ئایەتی (٣٠) دەکات:

لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) پیاوێك بە یەکێك لە شەقامەکانی مەدینەدا دەگوزەرێت، ئافرەتێك بەلایدا دەڕوات تەماشای دەکات، ئەویش واتە ئافرەتەکەش تەماشای ئەم دەکات، شەیتان ڕاڕایان دەکات و دەچێتە بن کلێشەیان تا چاو لەسەر یەك لانەبەن و

ببێتە نەزەری حەرام، ئیتر پیاوەکە هەر چاوی لەسەر ژنەکەیە و بەردەمی خۆی نابینێ تا دەم و چاوی دەدات بە دیوارێکدا و لوتی دەشکێت، دەڵێ واللە نابێت ئەو خوێنەی لوتم بشۆم، تا نەچمە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بەسەرهاتەکەمی بۆ باس نەکەم.

چووە خزمەتی و بۆی گێڕایەوە چی کردووە و چی بەسەرهاتووە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەمە سزای تاوانەکەت بوو)، لەم کاتەدا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ﴾ النور:٣١.

- ئیبن جەریریش دەگێڕێتەوە: ئافرەتێك دوو پاوانەی زیوی لە قاچ کردبوو، مورو زەنگۆڵەشی تێکەڵ کردبوو تادەنگی بێت، بەلای کۆمەڵە کەسێکدا تێدەپەڕێت کاتێك قاچەکانی دەدات لە زەوی خڕەی پاوانەکانی دێت و سەرنجییان ڕادەکێشێ، لەم کاتەدا ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی: ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾ النور:٣١.

وە مانای: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ کە سەرپۆشەکانیان دەدەنە سەردابا بێتە خوارەوە بەسەر شان و مل و سنگ و بەرۆکیاندا.

(ضرب) لێرەدا بە مانای: هێنانە خوارەوە و بەردانەوەیە.

خُمُر: کۆی (خمار) ئەو پارچە قوماشەیە سەری پێ دادەپۆشرێت.

جیوب: کۆی وشەی (جیب). واتە یەخە و ملیوان، ئەو شوێنەی کراس کە دەقڵیشێت تا سەری پێدا بکرێت کاتی لەبەرکردن و دواتر سنگ و ملی لێوە دیارە.

بیر لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بکەرەوە، بە پیاوەکەی فەرموو: کاتێك تەماشای ژنە نامەحرەمەکە دەکات و لوتی دای بە دیوارەکەدا دەفەرموێ: ئەمە سزای تاوانەکەتە! وریابە: بزانە چۆن خوای گەورە بۆ ئیماندار لە هەمان سات و ڕۆژدا تاوانەکەی ئەنجامدا سزایدا هەر لە خۆیدا، کاتی واهەیە سزاکەی بە ژنەکەی یا منداڵەکەی دەداتەوە.

یەکێ لە پیاوچاکان لەم بارەیەوە دەڵێت: (کاتێك تاوانێك دەکەم و سەرپێچی فەرمانێکی خوا دەکەم، خێرا لە هەڵسوکەوتی هاوسەرەکەم یا بەردەستەکەم بۆم دەردەکەوێت). زۆرجار شەیتان تاوانەکان بۆ خەڵکی بە بەرگی تاعەت و چاکە دەڕازێنێتەوە، لەجێی ئەوەی بە ڕووت و پەتی فریویان بدات، بۆئەوەی پێی بخەڵەتێن و شوێنی بکەون.

باشترین نموونەش بۆ ئەمە ئەو کاتەیە کە ئیبلیس بە باوکە ئادەم دەڵێ: ﴿هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٍ لَّا يَبۡلَىٰ﴾ طە: ١٢٠. ئایا دەتەوێت داری نەمریت پیشان بدەم، ئەو دارەی لێی بخۆیت ئیتر تا هەتایە بە زیندویی بمێنیتەوە و نەمریت، وە دەسەڵات و سامانێکی نەبڕاوەت پێ بناسێنم. کاتێك ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) بە نیەتی پاکی خۆی باوەڕی پێ کرد ئەو بەڵایەی بەسەرهات، بەم شێوەیە لەڕێگەی باشەوە شتی چاك و خواستی ئادەمیزادەوە فریوی دان.

# وەرزی یانزەیەم لەسەر ڕێی دەستگیرانیدا

## ١- کوڕ و چوونە پێشەوە بۆ خوازبێنی کچ:

وەك چۆن کوڕ دەگەڕێت بۆ کچێك پاك و ئیماندار بێت تا لەگەڵیدا لانەیەکی ئارام و بەختەوەر دروست بکات، بێگومان کچیش زۆر قورسە بۆی بڕیاردان لەسەر پەسەندکردن و ڕازی بوون بەو کوڕەی دێتە پێشەوە بۆ خوازبێنی. ئەم کچە خەون بە گەنجێکی شۆخ و دەوڵەمەند و ڕۆشنبیر و.. هتد، دەبینێت تا ببێتە هاوسەری ئایندەی.

ئایا ڕۆڵی ئەم سیفاتانەی کچە کە بۆ هاوسەرگیری دایناوە چییە؟!

(محمد رشید العوبید) لە کتێبی (لحظات یا بنات)دا لەم بارەیە دەپرسێت:

### أ- ئایا دەوڵەمەندی بۆ پیاو پێویستە؟

ئەوە مافی کچە مکوڕ بێ لەسەر ئەوەی ئەو گەنجەی خوازبێنی دەکات و دەبێتە هاوسەری ئایندەی، داهاتێکی مانگانەی باشی هەبێت، بەڵام نابێت پێداگری لەسەر ئەم مەرجە لەسەر حسابی ڕەوشت و دین بێت. سودی موڵکی قارون چییە گەر ئەو گەنجە خاوەنی بێت و بەڵام ڕەوشت و دینی لەگەڵ نەبێت؟! بزانە ڕۆزیدەر تەنها خوایە، چەندەها

گەنج گوزەرانێکی مامناوەندی بووە، لەگەڵ کچێك هاوسەرگیری کردووە کە ڕەزامەندبووە بەو داهاتە کەمەی، خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی باراندووە بەسەریاندا و بوونەتە یەکێك لە زەنگینەکان؟! چەندەهای تریش هەبوون دەوڵەمەند و خاوەن موڵك و سەرمایە، کچ لەبەر تەماع بۆ سەروەتەکەی شووی پێکردووە، بەڵام لە دواییدا هەموو سەروەتەکەی لەدەستداوەو ئاتاج بوون، لەبری ئەوەی لەزۆر و کەمی موڵك و سەروەتەکەی بپرسیت، بپرسە لە سەرچاوەی داهاتەکەی، ئایا لە ڕێی حەڵاڵەوە بەدەستی دێنێت، یا حەرام؟! هیچ کات دڵخۆش مەبە بەو سەروەتەی لە ڕێگای حەرامەوەیە، یا لە داگیرکردنی قوت و مافی خەڵکیدا دەستی کەوتووە. بێگومان هەرکات بێت خوا لەناوی دەبات و نایهێڵێت.

ب- ئایا (پیشە) ڕۆڵی هەیە لە سەرکەوتنی هاوسەرگیریدا؟!

کچان خەون دەبینن هاوسەرگیری لەگەڵ پزیشك، یا ئەندازیار، یا خاوەن کۆمپانیادا بکەن. وادەزانێت کێك لەم ناونیشانانەی پێوەبوو ئیتر خۆشبەختی دەکات، هەرچی داواکاری هەیە جێبەجێ دەبێت، دەستەبەری ژیانی پڕ ناز و نیعمەت و خۆشگوزەرانی بۆ دەکات.

بێگومان کێشە نییە، کچ پیشە و بڕوانامەیەکی لاپەسەندتر بێت لەوانیتر، بەڵام بە مەرجێك بوونی ئەم پیشە ببێتە هۆی بەختەوەری و خۆشگوزەرانی.

گرنگی بە کار و پیشە با دوای گرنگیدانت بێت بە دین و ڕەوشت و دەوروبەرەکەی، ژیان پڕە لە هەزاران هاوسەر کە بەهۆی پیشەی هاوسەرەکەیەوە تووشی کێشەبوون و ژیانیان لەق بووە، هەر ئەو پیشەیەی پێشتر کچەکەی ئاواتەخواز بووە لە هاوسەری ئایندەی!!.

ج- ئایا شۆخی و جوانخاسی هۆکارە بۆ سەرکەوتنی هاوسەرگیری؟!

مافی کچە کە لە شێوەی پیاوەکەی ڕازی بێت و ئاسودە بێ پێی، بێگومان جوانخاسی پیاو جیاوازە لە هی ئافرەت، کچ هەیە تەنها بالآبەرزی لا پێوەرە، هەیە شانپانی.. هتد.

پێوەرەکان جیاوازن، ئەبێ بزانین کچیش وەك کوڕەکە هەستی هەیە، دڵی هەیە، وەك حەزرەتی (عومەر) ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت: (زۆر لە کچەکانتان مەکەن بۆ شووکردن بە پیاوی ناحەز و ناشرین، کچانیش حەز و مەیلیان لەوەیە کە پیاوەکان حەزی پێ دەکەن).

بۆیە زانایان ڕایان وایە واباشە کچ خوازبێنی کارەکەی ببینێت، هەر چۆن کوڕەکە ئەو دەبینێت، بۆئەوەی لەسەرەتاوە بزانێت دڵی دەگرێت یان نا.

بەڵکوو ڕایان وایە پێویستترە و زەرورترە بینینی، وەك لە پەراوێزی (ابن عابدین)دا هاتووە: (بەڵکوو کچەکە لەپێشترە بیبینێت، چونکە پیاو ئەگەریش دوای هاوسەرگیریش پێی ڕازی نەبوو، دەتوانێ و ئاسانە لێی جیابێتەوە بە هەر بیانوویەك بێت). واتە: پیاوەکە بێ ئەوەی هیچ هۆکارێکیش دەست نیشان بکات جیادەبێتەوە، بەڵام کچە ناتوانێت.

لەبەرئەوە باوانی کچەکە هەڵە دەکەن ڕەزامەندی کچەکە ڕەچاو ناکەن، یا بزانن ئایا لەسەرو شێوازی ڕازییە یان نا؟.

هەمیشە ئاگاداربە ئەبێت ئەوەی لەپێشترە دین و ڕەوشتی کوڕەکە بێت، دواتر داهاتەکەی، بۆئەوەی توانای ماڵیی هەبێت ژیان بەرێت بەڕێوە، ئەمجا شۆخی و جوانخاسی لەبەرچاو بگرێت، هەندێك لە کچان شۆخی و جوانییەکەی لە هەموو شت لەلا مەبەسترە!!.

**خ- ئایا ئاستی زانستی و خوێندەواری ڕۆڵی هەیە بۆ پیاو؟**

هیچ کێشەی نییە ئەگەر هەردووکیان لە یەك ئاست بن، یا نزیك بن لەیەکەوە، بەڵام ئەوەی دەبێتە کێشە و گرفت ئەوەیە پلە و ئاستی زانستی کچەکە باڵاتربێت لە هی کوڕەکە، بە تایبەت ئەگەر کچەکە شانازی بەو زانستەی بکات و خۆی هەڵ بنێت بەسەر پیاوەکەدا. با بزانێت ئاستی خوێندن بە مانای ئاستی پێگەیشتوویی و تێگەیشتن نییە، بە مانای ڕەوشتبەرزی بێت، چەندەها هەن خاوەن ئاستێکی زانستی زۆر بەرز نین، بەڵام ئاستی ڕەوشت بەرزییان لە لوتکەدایە. چەندین خاوەن بڕوانامە و ئاستی زانستی بەرز پێگەیشتن و بیرکردنەوەیان زۆر ئاسایی، یا نزمە.

**د- ئایا جیاوازی تەبیعەتی کەسەکان کاریگەریی نەرێنی هەیە؟!**

لەوانەیە کچ ئەوەی دەیەوێت لە خوازبێنی کارەکەیدا بەدی کردبێت، لە خواناسی، دەوڵەمەندی، جوانی، ناو و ناوبانگ باشی خێزانەکەی، بۆیە ڕازی دەبێت و شووی پێ دەکات، دواتر لە پڕ دەوروبەری

سەرسام دەبن بەو ناکۆکییە توندەی لەنێوانیاندایە هۆکار چییە؟ خۆ لە ڕووی دینداری و ئاستی زانستی و کۆمەڵایەتی گونجاوبوون؟ ئەمەیە جیاوازییەکە:

نەگونجاندن پێکەوە و جیاوازی سروشت و تەبیعەتەکان. ڕەنگە کچەکە حەزی بە هاموشۆ و تێکەڵاوی و بەدەم خەڵکەوە بوون بێت، بە پێچەوانەوە پیاوەکە حەزی بە دوورەپەرێزی و تێکەڵاوی نەکردنی خەڵك و حەزکردن بەمانەوە لە ماڵەوە، ئافرەتەکە دەیەوێت سەردانی هاوڕێکانی و ناسیاو و دەرودراوسێ بکات، بەڵام پیاوەکەی بیەوێت هەر لە ماڵەوە بێت و چاودێری منداڵ و مێردی بکات.

بۆ ئەم مەبەستە ئامۆژگاریمان بۆ کچان ئەوەیە: سووربن لەسەر زانینی سروشت و خوو ڕەوشتی پیاو پێش هاوسەرگیری، دوای هاوسەرگیری ئەگەر نەگونجانێك هەبوو هەوڵ بدات خۆی بسازێنێت لەگەڵ واقیعەکە، هەرچۆن پێویستە لەسەر پیاوەکەش ڕەچاوی هەست و حەزی هاوسەرەکەی بکات.

هەردووك دەبێت بزانن ئەگەر بنەما گەورەکان گونجاوبوو لە دین و ڕەوشت و ئاستی ماددی و شێواز و شکڵی و خێزانی، ئیتر پێویست ناکات بگەنە ناکۆکی لە سروشت و تەبیعەتیاندا، بگەنە ئاستی ڕق لەیەك بوون و شەڕ و ئاژاوە و تێکدانی کۆشکی هاوسەرێتی.

***

### ٢- ساتە نائارامەکان:

لە ماوەی دەستگیرانێتیدا کە پڕیەتی لە هەستی خۆش و شادومانی، ڕەنگە هاوکات ئەم خۆشییە تێکەڵ بێت بە ساتی نائارامی و ترس لە شتە نادیارەکان و بیم و دڵەڕاوکێ لە بەرپرسیارێتی، ئەم ترس و نائارامییە زوو دەتوێنەوە و نامێنن، کاتێك ڕادەمێنی لە فەرمایشی پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الروم: ٢١.

واتە: (یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکانی تری خوای گەورە ئەوەیە کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون، بۆئەوەی ئارام بگرن لەلایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەمهێناوە، بەڕاستی لەو دیاردانەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوە و تێدەفکرن).

هەولبدە لەگەڵ ئەم وشە نەمرانەدا بژیت (ئارامی)، (خۆشەویستی)، (سۆز و میهرەبانی)، ئەمانە ئاسودەیی و دڵنیایی دەخەنە دڵتەوە.

لەوانەیە ماوەی دەستگیرانداریيەکە درێژە بکێشێت و ساڵ بخایەنێت، بەهۆی ئامادەکاری و باری ئابووری و خوێندنەوە، جا لەم ماوەیەدا زۆرجار کێشە و قسە و قسەڵۆك ڕووت تێدەکەن، بەڵام بزانە هەموو شتێك مەرج نییە لەسەرەتادا بەدەست بێت، نابێت وابیربکەیتەوە لە هەموو ڕەفتار و هەڵسوکەوتێکدا ڕێك وەك تۆ بێت، بەڵکوو خوو ڕەوشت و... هتد. دەکرێ جیاوازبێ لەسەرەتادا و دواتر پاشی تێکەڵی بگونجێنرێن.

### ٣- شارەزای کەسێتی بە:

- لەڕێگای یەکتربینینی شەرعییەوە ـ دوای مارەیی ـ شارەزای مەزاج و کەسێتی ببە.

- قسەکردنی، دیمەنی دەرەوەی لە خۆگۆڕین و جلوبەرگی، هەوڵبدە ئەویش لە تۆ شارەزا بێت و بە ڕاشکاوی هەموو شتێکی پێ بڵێ، لەوە خراپتر و ناشرینتر نییە کاتێك هەردوولا ماسکێکی جوان دەکەن بە ڕوویاندا لە ماوەی دەستگیرانیدا، دوای زەواج هەردووکیان ماسکیان لادەچێت ڕاستییان دەردەکەوێت!

- لە بارەی بابەتگەلێکەوە قسەی لەگەڵ بکە کە لەڕێیەوە بتوانیت شارەزای بیروبۆچوونی ببیت، تا ڕەفتاری گونجاو بدۆزیتەوە بۆ خۆسازکردن لەگەڵ ڕاو بیروبۆچوونەکانی.

- هەمیشە لە بیرت بێت کە هەر دەبێت هەردوولا هەریەك لە ئاستی خۆی دەست هەڵگرن و چاوپۆشی بکەن لە هەندێ مەرج و خواستی خۆتان، تا لێکنزیك بوونەوە و لێك تێگەیشتن دروست بێت لە نێوانتاندا، بتوانن بەرەو ژیانێکی بەختەوەر هەنگاو بنێن.

- لێی بپرسە: لە نوێژی، لە ڕۆژووی، بێ ڕیایی و پاکی، خواناسی، پەیوەندی لەگەڵ مزگەوت، لە هاوڕێکانی، ئایا چاك و خواناسن یان نا؟ باسی پاك داوێنی و شکۆمەندی لەگەڵ بکە، پێی بڵێ کە یەکەم ئیرەییت بە (چاوەکانیەتی) کە جگە لە تۆ بە حەزەوە تەماشای هیچ ئافرەتێکی تریان پێ بکات، فێری بکە کە غیرەی خوا توندترە، ئەو فەرموودەیەی بۆ باس بکە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه

وسلم) دەفەرموێت: (خوای گەورە غیرە دەکات، ئیمانداریش غیرە دەکات، غیرە و ئیرەیی خوای گەورە ئەوەیە ئیماندار ئەو شتە بکات کە پەروەردگار حەرامی کردووە). رواه احمد و ابوداود .

- تا پەیوەندیت لەگەڵ خوادا لە پەرەسەندندا بێت و باش بێت، ئەوا دەستگیرانەکەشت زیاتر لەخوا نزیك دەبێتەوە و باشتر دەبێت.
- ئەو کاتەی ئاوی دەستنوێژ دەموچاوتی پاککردۆتەوە و نور و ڕووناکی نوێژەکانت بەناو چاوتەوە دەدرەوشێتەوە، جەستەت بە جلوبەرگی لەخواترسی نەڕازاندۆتەوە، دڵنیابە بە بینینی ئەمانە ئەویش دێتەوە بەخۆیدا و دەگەڕێتەوە بۆلای خوای پەروەردگار.
- پەلەمەکە لەوەی یەکسەر هەرچی هەیە دەستگیرانەکەت بۆت بکڕێت و هەرچیت داواکرد جێبەجێی بکات، لەوانەیە داهاتەکەی یارمەتیدەر نەبێت بۆ ئەمە، بەردەوام داوای شتی لێ مەکە و داواکارییەکانت مەکە بە هۆکاری ناکۆکی نێوانتان.
- هەرگیز بەراوردی مەکە بە مێردی خوشکت ئەگەر ئەوان باری داراییان باشترە، لەوانەیە دەستگیرانەکەت پارەی کەمتر بێت و لەسەرەتاوەیە و هێشتا سەرو سامانی نەگرتووە، یا لەوانەیە باری ماددی کەمتر بێت و سۆز و خۆشەویستی و میهرەبانی زیاتربێت لە کەسانیتر، هەرگیز ئەو سیفات و ڕەوشتە جوانانە لەبیرمەکە و نادیدەیان مەگرە کە لە دەستگیرانەکەتدا هەیە، لەوانەیە لە زۆر ماڵی دونیا و سەروەت و سامان باشتربێت.

# وەرزی دوانزەیەم

# لە دەروازەی چوونەنێو کەژاوەی هاوسەرگیریدا

ئایا دەزانیت پرۆسەی هاوسەرگیری کە خوای گەورە کردوویەتی بە تاکە ڕێگای ڕێپێدراوی پەیوەندی نێوان کوڕ و کچ، بەڵگە و نیشانەی خوای گەورەیە لە بوونەوەردا، لەو پرۆسەیەدا خوای پەروەردگار ژن و پیاو بە پەیوەندییەکی پیرۆز بەیەکەوە دەبەستێتەوە، جا ئەگەر هاتوو لە ژینگەیەکی پاکدا نەشونمای کرد، بە پاکیزەیی و پرسوڕای باوك، یان خاوەندارەکەی و پیرۆزبایی دەوروبەر بونیات نرا، ئەوا بەردەوام و پایەدار و توندوتۆڵ دەبێت، بەڵام ئەگەر هات و لە تاریکییدا و دوور لەچاوی خزم و کەسوکار دروست بوو، لەڕێی پەیوەندییەکەوە کە شەرم دەکەن لەبەردەم خەڵکدا ئاشکرای بکەن و بەدزییەوە بوو، ئەوا بەخێرایی دەڕووخێت و وێران دەبێت! !

## ١- خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری:

ئایا ئەم خۆشەویستییە زەمانی ژیانێکی بەختەوەر دەکات؟ یان بە شێوەیەکی باشتر بڵێین، ئایا هەر کۆتاییەکەی دەگات بە زەواج و فەراهەمی ژیانێکی هاوبەش؟!

بێگومان کوڕ و کچ لەماوەی خۆشەویستییدا هەموو کارێك دەکەن بۆ ڕەزامەندی و ڕاگرتنی دڵی یەکتر، بە جوانی و ڕازاوەیی لەپێش چاوی یەك دەردەکەون، هەرچی خواستی یەکدییە بەجێی دێنن، بەدڵنیاییەوە ئەمە تا ماوەیەکی کاتی دەتوانن لەم فیلم و نواندنە بەردەوام بن، بۆیە هەر دوای ماوەیەك پێکەوەبوون و چەند ڕۆژێك دوای هاوسەرگیری ڕووی ڕاستیان دەردەکەوێت، کە دروست پێچەوانەکەیەتی.

زۆر کات کوڕان لەو ماوەیەی عاشقیدا خۆیان بە سەخی و دەستودڵ واڵا پیشان دەدەن، دوای زەواج زۆر ڕەزیل و چروکن.

کچ خۆی بە قانیع و گرنگی نەدان بە ماڵ و خەرجی پیشان دەدات، بەڵام دواتر زیادەڕۆ و هەموو ڕۆژ بەدوای مۆدیل و پەڵپی گۆڕانکاریدایە، بێگومان کاتێك کچێك خۆی دەخاتە بەر ئەومەترسییە و هەڵەشەییە، ئەوا یاریەکی مەترسیدار بەناوبانگ و شەرەفی خۆی دەکات، دواتریش بەهەموو ژیانی.

هۆکارەکەی ئەوەیە ئەو پیاوەی پێش زەواج خۆشت دەوێت و بەدزی خێزانەکەتەوە دەیبینیت، قسەی لەگەڵ دەکەیت و لەگەڵی دەچیتە دەرەوە، هیچ کات ڕێزت نییە لای با بەزارەکیش خۆی دەرخات، بۆیە ئەگەر هاتوو ئەم پەیوەندییە بەزەواج کۆتایی هات، بەدرێژایی ژیانی هاوبەشیان دڵی لێی پیسە و وادەزانێ بەدزی ئەمیشەوە لەگەڵ پیاوی تریشدا وادەکات، ئەمیش دەخەڵەتێنیت وەك چۆن دایك وباوکی دەخەڵەتاند، هەمیشە بێ متمانەیە پێی، زۆر جار

ژنەکە ناتوانێت بەرگەی ئەم هەموو بێ متمانەیی و بێ باوەڕیی و دڵ پیسییە بگرێت و بە جیابوونەوە تەواو دەبێت.

ئەمە ئەگەر هاتوو چوونە نێو ژیانی هاوبەشەوە، بەڵام لە زۆر حاڵەتدا وەکوو وتمان ناگاتە زەواج، چونکە ئەم کوڕە متمانە بە کچێك ناکات کە خۆی تەسلیم کردووە، دەڵێ ئەمە کە وای بۆ من کرد ئاسانە بۆ هەر کەسێکی تریش وابکات!

## ٢- خانەوادەکەی دەیانەوێت بیدەنە کوڕی مامی و کچەکەش خۆشی ناوێت:

کچێکی تەمەن پانزە ساڵ لە (دکتۆر یوسف قرضاوي) دەپرسێت: کە بنەماڵەکەی دەیانەوێت شوو بە کوڕە مامی بکات ئەم ڕازی نییە و حەزی لێی نییە، چی بکات؟

لە وەڵامدا پێی دەڵێت: مەسەلەی خۆشەویستی و حەزلێکەری لەم ڕۆژەدا زۆر بووە، بەهۆی فیلم و زنجیرەی تەلەفیزیۆنی و... هتد، کچان پەیوەست بوون بەم شتانەوە، من ترسم لەوە هەیە ئەم کچانە بەم جۆرە سۆز و ڕۆمانسییەتە بخەڵەتێن، بەتایبەت لەم تەمەنەدا کە تەمەنی هەرزەکارییە، دڵێکی خاڵی قسەی هەنگویناویش کاتێك چووە دڵی خاڵییەوە لێی دەنیشێت. بەداخەوە هەندێك کوڕی گەنج تەنها بۆ فریودان ئەمە دەکەن، چێژ وەردەگرن لەم کارە، لە دانیشتن و قسەکردنەکانیاندا خۆیانی پێوە هەڵدەنێن، کە دەڵێت ڕۆژێك لەگەڵ

فڵانە کچە و ڕۆژێك لەگەڵ ئەو کچ، چەند کچم لە یەك کاتدا شەیدای خۆم کردووە!!

ئامۆژگاریم بۆ کچانی مسوڵمان ئەوەیە بەم قسانە فریو نەخۆن، گوێ لە ئامۆژگاری دایك و باوك و خێزانەکەیان بگرن، هەرگیز بە تەنها بە سۆزێکی کاتی نەچنە نێو پرۆسەی هاوسەرگیری، چونکە پێویستە هەموو کاروبارەکان بە پێوانەی عەقڵ بپێویت ئەمە لە لایەك.

لەلایەکی ترەوە بە دایك و باوك و گەورە و خاوەن و بەخێوکەری کچانیش دەڵێم: با حەز و خواستی کچەکانیان ڕەچاوبکەن، نابێت باوك هیچ گوێ بە ویستی کچەکەی نەدات، بەدڵی خۆی بیداتە هەر کەسێك بیەوێت بێ ڕەزامەندی کچ و وەرگرتنی ڕای ئەو، ئەمە ئەم ژیانەی هەرچی بێت بۆ ئەم ناحەزە و وەك ناچارییەك وایە بەزۆر پێی کراوە، خۆ باوك ژیان لەگەڵ ئەو هاوسەرەی کچەدا ناباتە سەر تا تەنها بە دڵ و خواستی خۆی بکات، ئەوە کچەکەیە کە دەبێت هەموو ساتەکان لەژێر سەقفێکدا لەگەڵی بێت، بۆیە ڕەزامەندی کچ مەرجە بۆ زەواج، مەرج نییە هەر خۆشەویستی بوو بێت، نا بەلانی کەمەوە دەبێت پێی ڕازی و ئاسوودە بێت.

بۆیە وەك لە بابەتەکانی پێشتر باسمانکرد، تەماشاکردنی خوازبێنیکار و قسەکردن لەگەڵی پێویستە، تا ئەو کچە بزانێت دڵی دەیگرێت یان نا!

شەریعەتی ئیسلام دەیەوێت ئەو ژیانە هاوبەشە لەسەر بنەمای ڕەزامەندی هەر دوولا بێت، دەبێت کچ ئازادی ئەوەی پێ بدرێت

خواستی خۆی دەربڕێت، یان ئەگەر شەرمیشی کرد ئەوا بێ دەنگییەکەی ڕازی بوونیەتی: (البكر تستأذن وإذنها صمتها والأيم أحق نفسِها)، کچ پرسی پێ دەکرێت بۆ بە شوودانی و ڕای وەردەگیرێت. بێگومان گەر بێ دەنگ بوو ئەوا نیشانەی ڕازی بوونیەتی (بێوەژن)یش، واتە: پێشتر زەواجی کردووە ئیتر بەهۆی مردن، یان جیابوونەوەوە بێ هاوسەرە، ئەوا مافی خۆیەتی و دەتوانێت خۆی شوو بکاتەوە و بەڕاشکاوی بڵێت کە ڕازیم بەوەو شووی پێ دەکەم.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕازی نەبووە کچ بەبێ ڕەزامەندی خۆی و بەزۆر بدرێت بە شوو، (وەك ئەو فەرموودەیەی کە کچێك دێتە خزمەتی سکاڵا لەباوکی دەکات کە بەزۆر دەیداتە شوو)، کەواتە مەرجی هاوسەرگیرییە ڕەزامەندی کچ و باوکی، ئەمە زانایان بە مەرجی زەواجیان داناوە.

کەواتە وەك چۆن نابێت زۆری لێبکرێت کچەکە خۆی ڕازی بێت، بەهەمان شێوەش پێویستە باوك (ولی امر)ڕازی بێت، ئەگینا بەتاڵە بەبێ پرسی وەلی ئەمر (وَ أيما امرأةٌ نكحت بغير إذن وليُها فنكاحها باطل، باطل، باطل).

هەروەها ڕەزامەندی و پرس و ڕا وەرگرتنیش بە دایك پێویستە، وەك لە فەرموودەدا هاتووە: (أمروا النساء في بناتهن) رَواهُ أحمد و أبوداود. چونکە دایك بە حەز و ویستی کچەکەی ئاگادارە، کەواتە کاتێك کچ ڕازی بوو، باوك ڕازی، دایك ڕازی و خێزانی هەر دوولا ڕازی بوو، ئەوجا دوای ئەمە هیچ کات ئەو ژیانە خەفەتباری و خەم ڕووی تێناکات.

### ٣- پەیوەندی نێوان دەستگیرانەکان:

لە بەڕێز (شێخ سعید ڕەمەزان بوطی)یان پرسی لەبارەی سنورەکانی پەیوەندی نێوان دەستگیران (واتە کوڕ و کچ لە سەردەمی دەستگیرانیدا)، کە ئایا چی ڕێپێدراوە و چی قەدەغە و حەرامە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: سەرەتا کاتێك خێزانێك دەچنە داواکاری (خوازبێنی) بۆلای خێزانێکیتر و پرۆسەی هاوسەرگیری دەست پێدەکات، ڕەنگە ئەمە تەنها بە خوێندنی سورەتێکی فاتیحە تەواوبێت و بوکەخان دیاری بکرێت.

ئەم جۆرە خوازبێنی و مەراسیمە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی هەڵناگرێ و بە شەرعی نابنە مەحرەمی یەك، تەنها بە مەجلیسێك و داواکارییەك، ئەوە نابێتە مارەیی نێوان دوو هاوسەر. جگە لەمەش خوێندنی سورەتی (فاتیحە) کە بووەتە نەریت لای خەڵکی، بیدعەیە و هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نییە، ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی ڕاستەوخۆ حەرامێك حەڵاڵ بکات و جێگای مارەیی بگرێت، بڵێن ئیتر بە خوێندنی ئەم سورەتە ئەم دووانە حەڵاڵ بوون لەیەك و وەك دوو حەڵاڵ و هاوسەر ڕەفتار بکەن.

بۆ پەیوەندی نێوان دوو دەستگیران بەم شێوەیە، پەیوەندی نێوان دوو کوڕ و کچی ئاساییە و هیچ پەیوەندییەکی شەرعی و هاوسەرێتی نایانبەستێت پێکەوە، بۆیە نابێ وەك هاوسەر یەك ببینن و تێکەڵ بەیەك بن و چێژ لە یەك وەرگرن، بەڵکوو نابێت بەتەنهاش دانیشتن و

(خەڵوە) دروست بکەن، چونکە هێشتا مارەیی شەرعی نەکراون کە مەرجی خۆی هەیە. ئەمە لەڕووی حوکمی شەرعییەوە.

ئەمجا لەڕووی جێکەوتە و ئاکامە کۆمەڵایەتییەکان و یاساییەکان، کە بێگومان لەگەڵ حوکمە شەرعییەکەدا تەبان، چونکە ئەگەر ئەم ئاسەوارە زیانبارە کۆمەڵایەتی و یاساییانەی نەبوایە شەرعیش بەو جۆرە قەدەغەی نەدەکرد و ئاگاداری نەدەکردینەوە لێی، ئەم ڕێککەوتنەی نێوان خێزانەکان کە داواکارییە لەلایەن ماڵی کوڕەوە و ڕازی بوونی ماڵی کچەکەیە، تەنها پایەیەکی سەرەتای ئەو پرۆسەیەیە و وەرگرتنی ڕاوبۆچوونە و ڕێککەوتنە لەسەری و هیچیتر.

ئەگەر تەنها ئەم ڕێککەوتنە زارەکییە بێ، کەواتە پرۆسەکە ترسی ئەوەی هەیە ڕووبەڕووی لێکهەڵوەشان و نەمان بێتەوە، چونکە هیچ پەیوەندییەك نییە لە نێواندا، بە هەر هۆکارێك بێت، لەلایەن یەکێ لە خێزانەکانەوە بێ، یان یەکێ لە کوڕ و کچەکەوە بێ.

کەواتە کوڕەکە هەر شتێك بکات لە کچەکە لەم کاتی دەستگیرانییەدا، کچەش خۆی بدات بەدەستەوە و سەرەڕۆییەکی مەترسیدارە دەرەنجامەکەی سەلامەت نابێت، زیانەکەش بۆ کێیە؟ بێگومان زیان بۆ کچەکەیە و لەسەر بەرژەوەندی و ناو و ناوبانگی دەکەوێت.

ئایا چی ڕوودەدات کاتێك کوڕە خۆشی خۆی بەدەستهێناو (ئەگەر تەنها ڕابواردنێکیش بێ)، ماوەیەك بەم جۆرە بردیەسەر و دواتر شتێك هاتە پێشەوە، کەوا دەخوازێت ئەم پرۆسە و خوازبێنییە

هەڵوەشێتەوە؟ کوڕە هیچی لەدەست ناچێت، بەڵام کچەکە لەم گەشتە خەیاڵییەی دەگەڕێتەوە هیچی دەستنەکەوتووە، ئەوە نەبێ ناوبانگە باشەکەی لەدەستداوە، زۆر گومان دەخرێتە سەری دەرگای هەموو گومانە خراپەکانی بەسەردا دەکرێتەوە، ئەو بۆچوونانەی کە ستەمکارن بۆی، سەرەڕای ئەوەی لەوانەیە لەم گەشتە خەیاڵییەو پڕ لە وەهمەدا بەنرخترین شتی لەدەست دابێت، لە یەك ساتدا کە نە ئەم و نە کوڕە نەیانتوانیوە خۆیان بگرن لە بەردەمیدا، ئەوەش ڕوونە کە کچەکە لەم حاڵەتەدا هیچ کاغەزێکی یاسایی بەدەستەوە نییە تا سکاڵا بکات و داوای ماف و قەرەبوو بکاتەوە کە ناوبانگی تێدا لەکەدار بووە، نە مارەیی هەیە تا وەری بگرێت، نە هیچ بەڵگەیەك تا داوای پێ بکات و بەرۆکی کوڕەکەی پێ بگرێ، چونکە ئەم کارە لە دەرەوەی مارەیی شەرعی کراوە.

خۆ ئەگەر هاتوو ئەم دوو دەستگیرانە هەستیان کرد دوورکەوتنەوە لە یەکدی کارێکی قورسە، ئەوا ئاسانە ئەم دووانە لەبری ئەو پرۆسە (عورفییە) کە هیچ بەڵگەیەکی یاسایی و شەرعی نییە، مارەییەکی شەرعی بکرێن بەپێی بنەمای شەرعی و ئیتر هەرچیش ڕووبدات کێشە نییە با لە دادگاش تۆمار نەکرابن.

لەم حاڵەتەدا پەیوەندی هاوسەرێتی لە نێوانیاندا دەبەسترێت و هەموو تێکەڵی و چێژ وەرگرتنێك بۆیان حەڵاڵە، ئەگەر ئەم مارەییە ڕووبەڕووی هەڵوەشاندنەوە بێتەوە، لە ڕووی ماف و شەرعییەوە زەرەرمەند نابن، چونکە بە ئیمزای دوو شاهیدە لە هەردوولا، مافی هەردوولای تێدا دیاری کراوە.

## ٤- ئایا هیچ شتێکی باش لە هاوسەرەکەتدا نییە؟!

هەرگیز مەڵێ هیچی باشی تێدا نییە، مرۆڤ نییە شتی باشەی تێدا نەبێت! بۆچی ئەو شتە باشانە نابینین؟

بۆچی بۆ ئەو سیفاتە باشانەی ناگەڕێیت کە تۆ پێی نازانیت؟ هەوڵ بدە خراپەکانی لە یاد بکەیت، ئەم هەنگاوانە ڕەچاو بکە:

١. هەموو باشەکانی، ئەوەی بەلاتەوە گونجاوە تۆماربکە (ئەمە قۆناغی (قبولٚ)ە.

٢. بگەڕێ بەدوای شتێکی باشدا کە هەیەتی لەم لیستەدا نەتنووسیوە (ئەمە قۆناغی ڕازی بوونە).

٣. وەسف و مەدحی بکە لەو شتە باشەی هەیەتی (ئەمە قۆناغی ڕێزلێنانە).

کاتێك کە دەیخوێنیتەوە کە خاتوو فاطمە(خوا لێی ڕازی بێت)خۆی گەنم دەهاڕێت و ئاگر خۆش دەکات و ئاو دێنێت، وامەزانە ئەمە بۆ خزمەتی مێردە، مێینە لەخزمەت نێرینەدا! نا بەڵکوو ئەمە دایکێکی ئیماندارە ماڵدارییەك دەکات کە دڵنیایی و خۆشەویستی تێدایە، خۆی و ئەوەی هەیەتی پێشکەشی هاوسەر و منداڵەکانی دەکات.

لە ئیسلامدا ئەوە نییە پیاوی ماڵ فەرمان دەرکات و ژنیش زەلیلانە جێبەجێی بکات، بەڵکوو دوو هاوبەش هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانیان لەنێو خۆیاندا بەش کردووە بۆ سەرکەوتنی دوو شت بەیەکسانی: ژیانێکی دینی کە ئاسایشیان بۆ فەراهەم بهێنێت، ژیانی تایبەتی خۆیان.

قسەی(ئەسمای کچی ئەبوبەکر، (هاوسەری زوبەیری کوڕی عەوام)ت لەبیربێت کە دەڵێت: (من خزمەتی زوبەیرم دەکرد بە هەموو کارێك، ئەسپ و مەڕ و ماڵاتەکەیم ئاو و عەلەف دەدا، ئاوم دەهێنا، کشتوکاڵم دەکرد لەو زەویەیدا کە ١/٣ی فرسەخ بوو.. بەسەر ئەوەی تێکڕای زانایان ڕایان وایە ئافرەت لەسەری نییە ئەو کارانە بکات، بەڵام ئەمە لێرەدا دەچێتە بابەتی بەرژەوەندی هاوبەشی نێوان ژن و پیاوی ئیماندار و خواناس، مەسەلەکە لێرەدا مەحکومە بە سۆز و گیانبەختی، نەك هەستی شوێنکەوتەیی .

٥- ڕێگای چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکی بۆ ئاسان بکە:

ئاسانکاری بۆ هاوسەرەکەت بکە بۆ چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکی بەتایبەت دایکی و بەجێهێنانی سیلەی ڕەحم، چونکە کاتێك خوای گەورە لە مێردەکەت ڕازی دەبێت کە دایك و باوکی لێی ڕازی بن، ئایا ڕازی دەبیت مێردەکەت بەهیلاك بچێت و تۆیش بەر خەشم و ڕقی خوا بکەویت بە دوورخستنەوەی لە دایك و باوکی، هانی نەدەیت بۆ بەجێهێنانی ئەو واجبە: چاکە کردن لەگەڵیان و سەردانی کردنیان.

خاتوو عائیشە (وا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم): چ کەسێك گەورەترین حەقی هەیە بەسەر ئافرەتەوە؟ فەرمووی: (مێردەکەی)، هاوسەرەکەی، وتم: ئەی چ کەسێك گەورەترین مافی هەیە بەسەر پیاوەوە؟ خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (دایکی)، رواه الحاکم.

جا خۆت ئامادەبکە چ سزایەك کۆدەکەیتەوە بۆ خۆت، ئەگەر ئەو واجبە بەجێنەهێنیت، با ترست لە مێردەکەت ترس بێت لە خوا، لە پەنهانی و ئاشکرادا ئەرکەکانت بەرامبەری بەجێبهێنە، خۆی ئامادەبێت یان نا، وەك ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێ کردوویت.

### ٦- ئافرەتی زیرەك و لێهاتوو:

ئافرەتی ژیر ئەوەیە هەست بە پێداویستی و خواستی هاوسەرەکەی بکات، ئەوە بێت کە ئەو دەیەوێت و حەزی پێ دەکات، ئەمەیە ئەو هاوسەرداریتییە باشەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) هانمان دەدات لەسەری، وەك دەفەرموێت:

(بڵێ بەو ژنانەی تریش کە لەدوای تۆن: کە باش ڕەفتار کردن و بەجێهێنانی داواکارییەکانی مێردەکانتان و کردنی ئەوکارانەی ئەو پێی خۆشە، ئەوە پاداشتەکەی یەکسانە بەو جیهاد و ئەرکە ئاینییانەی پیاوان ئەنجامی دەدەن). البیهقی.

بزانە مێردەکەت حەزی بەچییە ئەوە بکە، زۆربەی پیاوان ئافرەتیان لەبەر ئەوە ناوێت کە مێینەیە، بەڵام لەوانەیە حەزبکات ژنانە بیت، خاوەن کەسێتی ئافرەتانە بیت، لەبەر ئەوە خۆت ڕۆشنبیر بکە، زانیاری وەرگرە لە چۆنیەتی ڕەفتارکردن و بەدەستهێنانی خواستەکانی لەسەر حەڵاڵ، بزانە کە ئێوە یەك گیانن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ البقرە:١٨٧. پێویستە نهێنی و عەیب و عاری یەکتر داپۆشن، بیرت نەچێت هەرکات

ئەم ئەرکانەت بەجێ هێنا و بەپێی شەرع جوڵایتەوە، تۆش مافت لەسەر ئەو هەیە پێویستە بۆت جێ بەجێ بکات، تا هەردوولا بەپێی ڕەزامەندی خوا بجوڵێنەوە بەرامبەر یەك.

## ٧- چۆن مێردەکەت (هاوسەرەکەت)بەختەوەر دەکەیت؟!

تۆ بەرپرسی لە بەختەوەرکردنی هاوسەر و منداڵەکانت، بیرت بێت بە ڕازی بوونی ئەو بەهەشت بەدەست دێنیت، پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)دەفەرموێت: (هەر ئافرەتێك بمرێت و مێردەکەی لێی ڕازی بێت دەچێتە بەهەشتەوە). رَواهُ إبن ماجة، الترمزي. کەواتە بەو ڕازی کردنەی ئەو بەهەشتی دونیا و دواڕۆژ بەدەست دەهێنیت.

- هەرگیز زیاد لەتوانای ئەرك مەخە سەرشانی. خوای گەورە دەفەرموێت:﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا﴾ البقرە:٢٨٦. خوای گەورەش بەپێی توانا تەکلیف و ئەرکەکان دەدات بەسەرماندا.
- هەموو خواست و داواکارییەکانت کەڵەکە مەکە بەجارێك پێی بڵێیت، تا گوشار نەکەوێتە سەری لەدەستت ڕابکات.
- ئەو ئەرکە مەخە سەری کە لە یەك کاتدا هەرچی باشە و سیفاتی چاك و ئاکاری جوانە تیایدابێت و ئەوەی تۆ حەزت لێیە بیکات، بێگومان دەگمەنە هەموو سیفەتە جوانەکان لە یەك کەسدا کۆببنەوە.

- پارێزگاری جوانی و شۆخ و شەنگیت بکە، هەروەها تەندروستیت و ئەندام ڕێکی، قسە خۆشی، بە دەنگی بەرز و ڕەق قسە مەکە، هەرگیز وشەی بازاڕی و ئاست نزم نەیەت بەدەمتدا.

- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە وەسفی ئافرەتی چاکدا دەفەرموێت: (کاتێك مێردەکەی تەماشای دەکات دڵخۆش دەبێت).

- پارێزگاری پابەندیت بە دینەوە بکە لە ناخ و ڕواڵەتدا، بەرگی شەرعی بپۆشە، لەلات ئاسایی نەبێت جەستەت ببینن، گەر خزمەتکار یان شۆفێر یان هەر نامەحرەمێکی تر بێت، با لەماڵەکەشدا بن، ئەگەر چاو پیاخشاندنێکیش بێت، هاوسەرەکەت غیرەت لێ دەکات و سوورە لەسەر ئەوەی هیچ کەسێك جگە لەوانەی مەحرەمن پێستت نەبینن بەبێ حیجاب.

- خۆت جوان بکە و خۆت بڕازێنەرەوە پێش ئەوەی ئێواران مێردەکەت بگەڕێتەوە ماڵەوە، با بە باشترین و جوانترین شێوە بتبینێت، جلێکی پاك و جوان لەبەربکە، بۆنی خۆش لەخۆت بدە، بەتایبەت ئەو بۆنانەی ئەو بەلایەوە خۆشە.

- خۆت سەرقاڵی کاری ناوماڵ مەکە لای مێردەکەتدا، بەشێوەیەك هەرچی کاری ناوماڵ و چێشت لێنان و پاککردنەوە هەیە بیخەیتە ئەو کاتەی ئەو دێتەوە بۆ ماڵەوە ماندوو هیلاکە.

- ئاخ و داخ هەڵمەکێشە بۆ ئەو سۆزە زۆر و هەستە هەڵقوڵاوە و خەونەی پێش هاوسەرگیری تێیدا ژیاویت، بێگومان پاش هاوسەرگیری هێور دەبێتەوە و دەبێت بە سۆزێك لەسەرخۆ و هاوسەنگ.

- ئەگەر پیاو خاوەنی قسەی یەکەمە لە پەیوەندی ژن و مێردایەتیدا، ئەوا تۆ بەرپرسی لە سەرکەوتن و گونجان و ڕێککەوتن لەو هاوسەرگیرییە، هەر چەندە زانست و ڕۆشنبیریت بگاتە لوتکە، پلەوپایەت هەبێت، لێبوردەبە لەگەڵ هاوسەرەکەت و پەنای بۆ بەرەو پشتی پێ ببەستە، بەرهەڵستی مەکە و دژی ڕاوبۆچوونەکانی مەوەستە.
- وشەی شیرین و بەسوود بەکاربهێنە، خەندەی ڕەونەقدار، گاڵتەو گەپی دڵخۆشکەر، ڕووی خۆش و بەچێژ، دووربکەوە لە دڵتەنگی و غەم و ناوچاو گرژی و خەمۆکی، زۆر بڵێی و بۆڵە بۆڵ.
- کارزانی و لێزانی و وریاییت دەرخە بۆ پیاوەکەت بەسەر ژنانی تردا، وابەستەیی مێردەکەت زیاتر دەبێت بۆت، شانازی بەو کەسایەتییەتەوە دەکات، هونەر بەکاربهێنە لە هەر کارێك کە دەیکەیت.
- کات زایە مەکە بە قسە و زۆر بڵێی و هەرزە گۆیی لە تەلەفۆندا لەگەڵ هاورێکانت، یان خۆسەرقاڵکردن بە گۆڤاری بێ سوود و هەواڵی هونەرمەند و ئەکتەر و.. یان بە مۆبایل و ئینتەرنێت.
- بۆ خوێندنەوە کتێب و گۆڤارێك بەکاربهێنە سوودی هەبێت بۆ عەقڵ و دڵت، ڕۆشنبیری و زانیاریت پێی زیاد بێت و یارمەتیت بدات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانت لەنێو ماڵ و مناڵەکەت، هەروەها بۆ تەماشای بەرنامەکانی تیڤی هەمان مەبەست و ئامانجت هەبێت.
- کاتی گونجاو هەڵبژێرە بۆ باسی کێشەی خێزانەکەت و وتووێژ لەسەری.

- پەلە مەکە لە گلەیی کردن، هەر مێردەکەت هاتەماڵەوە دەست بکەیت بە سکاڵا و بۆڵە بۆڵ لەسەر هەندێك شتی لاوەکی.
- داوا لە هاوسەرەکەت مەکە ڕۆڵی پۆلیس بگێڕێت لەنێوان تۆ و مناڵەکانت، لە تاوانبار بدات و تەمبێی بکات و سزای بدات!
- لەپێش چاوی مناڵەکانت ڕەخنە لە مێردەکەت مەگرە، هەرگیز وشە و دەستەواژەیەك بەکارمەهێنە بەرامبەر مێردەکەت لای مناڵەکانتدا، تاوەکوو دواتر ئەوانیش نەیڵێنەوە و بێڕێزی پێ بکەن.
- کێشەی ماڵەکەت مەگەیەنە بە خێزانەکەت، تا ڕق و دوژمنایەتی کەسوکارت لە مێردەکەت دروست نەبێت، بەڵکوو کێشەکانت لەگەڵ هاوسەرەکەت چارەسەر بکە و مەیبە دەرەوەی ماڵەکەت.
- هەرگیز خۆت بە گەورە مەزانە و لوتبەرز مەبە بەرامبەری، با لەویش دەوڵەمەندتر و ئەسڵ و نەسەبدارترو ئاستی زانست و ڕۆشنبیریت بەرزتر بێت.
- لەکاری ژن و مێردایەتیدا ڕێگری مەکە، پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)دەفەرموێت: (إِذا دعا الرّجُلُ إمرأةِ إلي فِراشِهِ، فَلَمْ تَأْتِه، فَبات غَضْبان علَيها، لَعَنتها الملائكة حتي تصبح). رَواهُ البخاري و مسلم.
- لە بیرت بێت یەکەم مافی مێرد لەسەر ژنەکەی گوێڕایەڵییەتی، پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)دەفەرموێت:(لَو كُنت أمراً أحَداً أنْ يَسجُد لأحَد، لأمرت المرأة أنْ تَسجد لِزَوجها).الترمذي.

- فەزڵی مێردەکەت لەبیر مەکە، پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لە یادکردنی فەزڵی هاوسەری بە هۆکارێك داناوە بۆ چوونە دۆزەخ و بە کوفرانی نیعمەت و سپڵەیی ناوی دەنێت.
- ماڵی مێردەکەت بپارێزە، بەبێ پرسی و ئاگاداری خۆی ماڵەکەی مەبەخشە، یان پرسی پێ بکە، یان دڵنیابە کە ڕازییە.
- هەراسان و وەڕز مەبە لەکاری مێردەکەت، ئەوە شتێکی خراپە هەندێك لە ئافرەتان دەیکەن، گلەیی و گازندەکردن و تاوانبارکردنی مێردەکەت کە کەم تەرخەمە و گەیاندنی بە ماڵی باوك و کەسوکاری.
- بزانە ماڵێك پڕ بێت لە ئاشتی و خۆشەویستی، ڕێزی نێوان یەکتر لەگەڵ پارچە نانێکی ڕەق و ئاوێکدا باشترە لە ماڵێك پڕ لە گۆشت و نان و چێشتی خۆش و سفرەی ڕازاوە، بەڵام شەڕ و ئاژاوە و ناکۆکی تێدا بێت وەك دوو دوژمن لە ماڵێکدا!!



# وەرزی سیانزەیەم کارکردنی ئافرەت

ئافرەت وەك پیاو مرۆڤە، ئەم لە ئەو و ئەویش لە ئەم، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍۖ﴾ آل عمران:١٩٥.

ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتان هەندێکیان خۆشەویست و پشتگیر و هاوکاری یەکترن.

مرۆڤ بوونەوەرێکی زیندووە، سروشتی وایە دەبێت بیربکاتەوە و کار بکات، ئەگینا مرۆڤ نییە، خوای پەروەردگار مرۆڤی دروستکردووە کار بکات و کەسێکی جوڵاو بێت، تاکوو تاقی ببنەوە کامیان کاری باش و چاکتر دەکەن.

ئافرەتیش وەك پیاو بەرپرسیارە لە کاردا و پاداشت وەردەگرێت لە بەرامبەردا، وەك دەفەرموێت: ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَـٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰۖ﴾ آل عمران:١٩٥. هیچ کار و کردەوەیەکتان زایە ناکەم و پاداشتی وەردەگرن هی ژن و پیاوتان(نێر و مێ). بێگومان لە دوارۆژدا پاداشتی کارە باشەکەی وەردەگرێت، وە لە دونیاشدا بەخشش دەدرێت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةًۖ﴾ النحل:٩٧. واتە: (ئەوەی کار و کردەوەی

چاك بكات، پیاو بێت یان ئافرەت ڕێبازی ئیمان بەرنەدات (لەهەر بارودۆخێکدا)، بەڕاستی بە ژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دونیادا دەژی و لە قیامەتیشدا پاداشت دەکرێت بە جوانترین پاداشت)،

وەك هەمیشە دەوترێت ئافرەت نیوەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە، هەرگیز وامەزانە ئیسلام ئەم نیوە گرنگەی کۆمەڵگا لە کار دەخات و پەراوێزی بخات، یان بێ جووڵە و بێ کاری بکات، لە ژیان وەرگرێت و لە بەرامبەردا هیچی پێ نەبەخشێت، خۆشی و باشییەکانی سوود لێوەرگرێت و بەکاریان بهێنێت، هیچ بەرهەمێکیشی نەبێت.

کاری ئافرەت گەورەترین و سەرەکیترین کارە کە کەس ناتوانێت ڕکابەری بێت، ئەویش پەروەردەی نەوەکانە، کە خوای گەورە هەر لە سەرەتاوە لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە ئامادە و سازی دەکات بۆ ئەو ئەرکە گرنگە، بۆیە پێویستە هیچ پیشەیەکیتر بە هەر نرخێك بێت سەرقاڵی نەکەن لەو پەیامە گرنگ و گەورەی هەیەتی، هیچ کەسێك ناتوانێت بچێتە ئەو شوێن و پێگەی ئافرەت و جێگای بگرێتەوە لەو کارە گەورەیەدا، کە ئایندەی ئەو ئوممەتەی لەسەر وەستاوە، بەوە گەورەترین و گرنگترین سامانی میللەتی لێ پێکدێت، کە سامانی(مرۆڤایەتی)یە.

ڕەحمەتی خوا لە شاعیر (حافظ ابراهیم) کە دەڵێت لە وەسفی ئەم بوونەوەرەدا:

(الأُم مَدْرَسَةٌ إِذا أَعْدَتها      أَعْدَت شَعْباً طَيباً الأَعْراق)

هەروەها جگە لەمەش ئەركی چاودێری خێزان و بەختەوەری هاوسەرەكەی و پێكهێنانی خێزانێكی بەختیار لەسەر بنەمای خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی، لە فەرموودەدا هاتووە ئافرەتێك بەم شێوەبێت و هاوسەرێكی باش بێت بە تەواوی مانا، ئەوا پلە و پاداشتی جیهادكردنی هەیە لەپێناوی خوادا.

دكتور یوسف قەرزاوی دەڵێت:

((ئەمە بە مانای ئەوە نایەت كاری ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ ڕێ پێنەدراو و قەدەغە بێت، بۆ هیچ كەس نییە بەبێ دەقێكی شەرعی ڕوون و ئاشكرا و بەڵگەوە شتێك حەرام بكات)).

لەسەر ئەم بنەمایە دەڵێین كاركردنی ئافرەت جائیزە، هەندێ جار بابی(استحباب)و، هەندێ جار(بابی وجوب)، بەپێی پێداویستییەكان: وەك ئەوەی بێوەژنێكەو هیچ داهاتێكی نییە، كەسیش نییە خەرجی بدات، دەتوانێت هەندێك كار و كاسبی بكات تا لە زەلیلی و دەست پانكردنەوە و منەتی خەڵكی بەدوور بێت.

یان خێزانەكەی پێویستی پێیەتی كاربكات، وەك یارمەتی هاوسەرەكەی یان برا و خوشكی بچووكی هەیە، یان باوكی بەتەمەن و پەككەوتەیە، وەك لە بەسەرهاتی كچەكانی شوعەیب (سەلامی خوای لەسەر بێت) دا هاتووە(پێشتر باسمان كرد)، هەروەها چیرۆكی ژیانی خاتوو ئەسمای خێزانی (زوبیر بن عوام)، (كە پێشتر باسمانكرد).

یان كۆمەڵگە پێویستی پێیەتی كاربكات، وەك پزیشكی و برین پێچی بۆ ئافرەتان، مامۆستایەتی و فێركردنی كچان، یان هەركارێكی

لەو بابەتانە کە تایبەتن بە ئافرەتانەوە، بەڵام دەبێت ئیشەکە سەروکاری لەگەڵ ئافرەتاندا بێت تا پیاوان، ئەگەریش لە حاڵەتێکدا قبوڵی ئەوەی کرد، بۆ نموونە پزیشکەو چارەسەری پیاو بکات، ئەوا پێویستە لە بابی پێویستدا بێت و بەپێی زروف و بارودۆخەکە بێ، نەك وەك بنەمایەکی جێگیربێت.

## بەچەند مەرجێك ڕێ دەدرێت بە ئافرەت کاربکات و بە جائیز دادەنرێت:

١. دەبێت خودی کارەکە شەرعی بێت، واتە لەڕووی شەرعەوە ڕێ پێدراو بێت و ناشەرعی تێدا نەبێت، واتە نابێت لەخۆیدا حەرام بێت، یان ڕابیکێشێت بۆ حەرام، وەك سکرتێری و خزمەتکاری پیاوێکی گەنج کە تەنهایە و خەڵوە دروست دەبێت لە نێوانیاندا، یان سەماکارێك بێت، یان لە باڕ و مەیخانەکاندا کار بکات ئارەق و مەی و مەززە پێشکەش بکات، یان دروستی بکات، یان کڕین و فرۆشتنی پێوە بکات، یاخود کارەکەی وابێت سەفەری دوور و مانەوە لە وڵاتاندا بەبێ مەحرەم، یان هەر کارێکیتر کە ئیسلام حەرامی کردووە لەسەر ئافرەت، یان لەسەر ژن و پیاو بە هەر دووکیانەوە.

٢. پێویستە پابەندبێت بە حەیا و ڕەوشت جوانییەوە لە جل و بەرگ و، ڕۆیشتن و قسەکردندا (کە شێوازەکانی بە ئایەت لە بابەکانی تردا باسمان کردووە)، ( هەروەها تەواوی مەرجە شەرعییەکانی باسکراوە)،

٣. نابێت کارکردنی ئافرەت لەسەر حسابی ئەرکەکانی تری بێت و پشتگوێیان بخات، وەك ئەرکی ژن بۆ مێرد و منداڵەکانی، کە ئەرکی یەکەم و بنەڕەتییە.

## بنەما شەرعییەکان بۆ کارکردنی ئافرەت

دکتۆر حمد لوتفی سەباغ دەڵێت:

ئافرەت مافی کاروکاسپی هەیە، بەڵگەش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە:

﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ﴾ النساء: ٣٢.

واتە: (پیاوان پاداشت و بەشیان بەپێی هەوڵ و کۆششی خۆیانە، ئافرەتانیش لە بەرامبەر کاروکۆششی خۆی بەش و مافی خۆی هەیە).

❖ بەڵام کارکردنەکەی پێویستە لە چوارچێوەی مەرجە شەرعییەکاندا بێت، نابێت تێکەڵی لەگەڵ پیاو تێدابێت، تێکەڵییەکی بێ پەردە و شەرم، (خەڵوە)ـی تیادا نەبێ، واتە دوو بە دوو تەنها لەگەڵ پیاوێکدا کۆنەبێتەوە، وەك ئەوەی هەیە سکرتێری بەڕێوبەرێکە بە تەنیا لە شوێنێکدان، یا لە دوکانێکدا و... هتد.

❖ ئەم کارە بەرەو فیتنە و خراپەی نەبات، کارەکەی پەیوەست نەبێ بەوەی تەنها تایبەت بێ بەڕاییکردنی کاری پیاوەکان، هەمیشە لە قسە و پەیوەندی بێ لەگەڵیاندا، تا ئاوێنەیان بێ لەبەر بەرژەوەندی کارەکەی.

❖ دەبێت لەو کارەدا حورمەت و پۆشتەییەکەی پارێزراوبێت. نەك ئەوەی لەبەر کارەکەی حیجابەکەی شل کات و واز لە بەرگی شەرعی بهێنێت بۆ ئەوەی خوازراو بێت.

زۆر بواری باش و شیاو هەیە بۆ ئافرەت کاری تێدا بکات، وەك: پزیشکی ئافرەت و کاری پەروەردە و فێرکردن. جا چەندە جوانە ئافرەتی پسپۆڕی هەموو نەخۆشییەکانمان هەبێ و ئافرەت بچێتە لایان و ناچار نەبن بچنە لای پزیشکە پیاوەکان.

ئەم جۆرە کارانە سودی گشتی هەیە، نەك تەنیا تایبەت و بژێوییەك بۆخۆی، بەڵکوو بە هەموو کۆمەڵگە سودی دەبێت. کەواتە ئەم هۆکارانە لە دەرەوە و بە پەیڕەوی کردنی تەواوی مەرجە شەرعییەکان دروستە و شەرع ڕێگری ناکات.

تەنها پێویستە ئەوە بزانین کە کارکردن ڕێگری تێدا نییە ئەگەر هاتوو بۆ پێویستیی بوو، لەگەڵیدا سنوری شەرعی تێدا پاێزرابێت، کارکردنی ئافرەت لەدەرەوەی ماڵ ئەرکێکی قورس دەخاتە سەر شانی، چونکە ئەم دایکە و سروشتی دایکایەتی، یان هاوسەرداریێتی وەهایە لەماڵ بێت ئاسوودەترە، چونکە ئەو ئەرك و بەرپرسیارێتییەی هەیەتی، پێویستی بەخۆ یەکلاییکردنەوەیە، هەر لە مناڵ بوون و بەخێوکردنی و ماڵداریێتی، کە کاتێك لەگەڵ ئەمانەدا کە سروشتی خۆیەتی و ناتوانێت دەست لەو فیترەتەی هەڵبگرێت، گەر لەدەرەوەش کاربکات، یان ئیجبار بکرێت بە کارکردن، ئەوا قورساییەکی زۆد دەکەوێتە سەر شانی و ناتوانێت بەرگەی بگرێت.

لە ڕاپۆرتی ڕێکخراوی (تەندروستی جیهانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستدا) هاتووە ((لە هەموو حاڵەتێکدا شایستە نییە ئافرەت ئەو کارانە بکات کە لەگەڵ سروشتی و پێکهاتەی جەستەیی ناگونجێت، دەبێت ئەو کارانە بکات کە گونجاوە لەگەڵ مێینیەکەیدا، وەك: پزیشکی ئافرەت و برینپێچی و فێرکردن و چاودێری کۆمەڵایەتی و نووسین و چاپ و بڵاوکردنەوە.. و هەر کارێکیتر شایستەی بێت و گونجاو بێت، بۆی بەڵام وەك ئەوەی کاربکات وەك پیاو، پۆلیس و میکانیك و پاککەرەوە، شۆفێری بارهەڵگر و لەو بابەتانە، ئەوە نەشایستەیەتی، نە جائیزیشە)).

### کاری ئافرەت بە ڕاو بۆچوونی نووسەرێکی ئینگلیزی:

نووسەری ئینگلیزی (خاتوو ڕادی کۆك)لە گۆڤاری(ئیکۆ)دا دەڵێت: (( تێکەڵاوی پیاو بۆ خۆی دایناوە، بۆیە ئافرەت ئارەزووی بە شتێکە و شوێن شتیك کەوتووە کە پێچەوانەی سروشت و فیترەتییەتی، هەر لەبەر زۆری ئەم تێکەڵاوییە بێ مەرجەیە منالی زینا زۆر دەبن، کە بەڵایەکی گەورەیە بەسەر شانی ئافرەتەوە. دواتر دەڵێت: ((ئێستا کاتی ئەوەیە بزانین بەچی کەم دەبێتەوە-ئەگەر نەڵێین نەیهێڵین- ئەمە بەڵایەکە هاتووە بەسەر شارستانێتی ڕۆژئاوادا، ئێستا پێویستە ڕێگایەك بدۆزینەوە ڕێگە بگرین لە کوشتن و لەناوبردنی ئەو هەزارەها مناڵەی هیچ تاوانێکیان نییە، (بەهۆی زیناوە دەبن و لەناویان دەبەن)، تاوان تاوانی ئەو پیاوانەیە ئافرەتیان نقووم کردووە بە دڵ نەرمیان،

ئەی باوکان و دایکان چەند درهەم و دینارێك نەتانخەڵەتێنێت کە کچەکانتان لە ڕێی کارەوە بەدەستی بهێنن و بەو ڕێگا ناشەرعیانەی باسمان کرد، (کە کاسبی و کارکردنی ڕێگە پێ نەدراوە).

فێریان بکەن چۆن دووربکەونەوە لە پیاوی نامەحرەم، ئاگاداریان بکەن لەو فێڵ و تەڵەکانەی لە بۆسەدان بۆیان، باسی ئەو ئامارەمان کرد ئەو بەڵایانەی لە زیناوە بەرهەم دێن، لە تێکەڵاویەوەیە هەتا تیکەڵاوی هەبێت زیاتر و زۆرتر دەبن، نابینی زۆری ئەو ژنانەی تووشی زینا و زۆڵ خستنەوە دەبن ئەوانەن کە لە کارخانەکان کاردەکەن و خزمەتکارەکانن کە ڕووبەڕووی مەترسی دەبنەوە، ئەگەر دەرمان و ئەو پزیشکانە نەبوونایە بۆیان لەبار دەبەن، چەندان بەرامبەری ئەو ئامارانەمان دەبینی، ئەم حاڵەتە ڕیسوایی بەسەردا هێناوین، ئەوەش مەبەست لێی کەوتنی نێو شارستانییەکانە )).



# وەرزی چواردەیەم ئافرەت و چوونە بازاڕ

## ١. بۆچی دەچیتە بازاڕ؟!

ئافرەت هەیە هیچ خەمی نییە بازاڕکردن و شت کڕین نەبێت، هیچ شوێنی نییە بازاڕ نەبێت، بیر لە هیچ ناکاتەوە ئەوە نەبێت چی کڕیوە؟ چی بکڕێت؟ ئەوە بە چەند بێت؟ ئەوە لە کوێ هەیە؟ هەر کە دوکانێکی تازەی بیست ڕا ئەکات بۆی، یان کە هەڕاج و تەنزیلاتێك لە شوێنێك هەبوو بۆی دەڕوات!

هەیە بۆ کاری پێویست دەچێتە بازاڕ.

هەیە بۆ کات بەسەربردن و خۆشی.

هەیە بەدوای ڕیکلام و هەڕاج و تەنزیلات.

ژمارەیەکیش هەن بۆ ئەوە دەچن بزانن چی تازە هاتووە، مۆدێلی نوێ چییە؟

هەیە بووە بە پسپۆڕ و شارەزا تیایدا: کام دوکان و مۆڵ کراوەتەوە؟ کەی تەنزیلات دەست پێدەکات....هتد.

## ٢. ئادابی ئیسلامی بپارێزە:

بەدڵنیاییەوە ئافرەت هەیە بە جلوبەرگی شەرعی و لەگەڵ مەحرەمی خۆیدا دەچێت.. حیجابی لا دەبات و خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ بازاڕ و پیاوە نامەحرەمەکان.. وە جۆرەهای تر.

لەهەر حاڵەتێکدا تۆ ئەو فەرموودە بەبیر خۆت بهێنەرەوە کە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)دەفەرموێت: (خۆشەویسترین جێگا لای خودا مزگەوتەکانە و خراپترین جێگا کە ڕقی لێی بێت بازارەکانە). المسلم.

وەکوو سەلمانی فارسی -ڕەزای خوای لەسەر بێت-، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ( لەو کەسانە مەبە یەکەم کەس دەچنە بازاڕ و کۆتا کەسیش مەبە لێی دەردەچیت. شەیتان تیایدا هێلکە دەکات و جووجەڵە هەڵدێنێ). الطبراني، مەبەست لێی شوێن و شەڕگەی شەیتانە.

خۆت هەڵمەکێشە بە شتێکەوە کە نیتە، بۆ ئەوەی لای خەڵك فیز بکەیت و خۆت هەڵنێیت، لە خاتوو عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: ژنێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)عەرزی کرد:

(مێردەکەم ئەوەم ناداتێ کە من خۆمی پێ دەرخەم، مەبەستی ئەوە بووە بۆ خۆهەڵکێشان لای خەڵك، یان(هەوێ)کەی وا دەریدەخات کە لە هەموو شت تێر و پڕە و خۆی هەڵدەنێ). البُخاری و المُسلم.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێ: وەك ئەوە وایە بەرگی درۆ بپۆشی. واتە کەسی وا هەیە بەرگی تەقوا و لە خواترس دەکات بە بەریا و وا دەری دەخات کە خواناسە، بەس ڕیاییە و لە بنەڕەتدا وا نییە، ڕەفتاری ئەم ئافرەتەی چواندووە بەوە).

-بە ئاگابە لەوەی جلێك بکڕیت و بیپۆشیت بۆ ناوبانگ و فیزکردن بێت بەسەر خەڵکیدا و تووشی لوت بەرزی و لەخۆبایی بوونت بکات (مَنْ لَبَسَ ثَوْبَ شُهرة في الدُّنيا أَلْبَسَه اللهُ ثَوْبَ مذلة يَومَ القيامة). أحمد و أبو داود.

واتە: (هەر کەسێك لە دونیا جلوبەرگی ناوبانگ و بەسەر خەڵکدا خۆ دەرخستن لەبەر بکات لە دوارۆژدا خوای گەورە بەرگی زەلیلی و سەرشۆڕی دەکات بە بەریدا). پەنا بەخوا وەك ئەوەی ئێستا دەیبینین نە بەڕەوشتی جوان و نە زانست ناو دەردەکەن، بەڵکوو دەڵێن فڵانە ئەکتەر و هونەرمەند کچی فڵان کەس جلەکەی و عەزیەکەی بایی ئەوەندە هەزار، یان ملیۆن دۆلار بوو.

ئیبن ئەسیر دەڵێت: جل و بەرگی ناوبانگ ئەوەیە لە ڕەنگ و شێواز و(مۆدیلدا)جیاوازی خەڵکەکە بێت و هەمووی سەیری بکات، ئەویش بەو تەماشا کردن و ئاماژە بۆ کردنە تووشی لە خۆبایی و لوت بەرزی ببێت.

### ٣. نزای چوونە بازاڕ:

کاتێك دەچیتە نێو بازاڕ زیکری خوا بکە، نزای چوونە بازاڕت لەیاد نەچێت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (( مَن

دَخَلَ السُوقَ فقال: لا إلهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لهُ لهُ المُلكُ وَ لهُ الحمدُ يُحيي وَ يُميت وَهو حَيٌ لا يَموتُ بيدهِ الخَير وَهوَ علي كُلِ شَيءٍ قدير.. كَتَبَ اللهُ لهُ ألفَ ألفَ حَسَنَة وَ مَحا عَنهُ ألفَ ألفَ سَيئَة وَ رَفعَ لهُ ألفَ دَرَجَة)). رَواهُ الترمذي.

واته:( هەر کەس بچێتە بازاڕ ئەو نزایە بخوێنێت، ئەوا هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنووسرێت، هەزار هەزار خراپەی دەسڕێتەوە، هەزار هەزار پلە بەرزدەبێتەوە ).

د.عبدالملك قاسم لە کتێبی (هاربات إلى السوق)دا، دەڵێت: (کورت و پاڵفتە قسە لەگەڵ فرۆشیاردا بکە و گاڵتە و شۆخی مەکە، خۆت ناسک مەکەرەوە و بە نازەوە قسە مەکە، دوور بکەوەرەوە لە زۆر بڵێی و چەن و چوونی مامەڵەکردن لەگەڵ دوکاندارەکاندا، مەچۆرە دوکانێك چۆڵ بێ و خاوەنەکەی لێ نەبێت، شان شانێن مەکە لەگەڵ پیاواندا و لە چۆڵەوانی برۆ و بە پەنادا، هەرگیز جل تاقی مەکەوە و بیگری بە خۆت لەلای دوکاندارەکەدا، یان پێڵاو بکەیتە پێت لای فرۆشیارەکە، هەموو شتەکانی پێ دامەگرە و تەماشای هەمووی بکەیت، هەرگیز لای ئاڵتونچیدا دەستت مەدە فرۆشیارەکە موستیلە و بازن بکاتە دەستت، بزانە باوکت هاوسەرت متمانەیان پێتە، بەڵام متمانەیان بەو گورگانە نییە دێن و دەچن لە بازاڕەکاندا، بیرت نەچێت چوونەدەرەوەی ئافرەت بە تەنها گورگەکان ڕادەکێشێت زەفەرت پێ بەرن، جێی سەرسوڕمانە باوك، برا، هاوسەر دادەنیشن لەماڵەوە و هاوسەر و کچ و خوشکیان دەچنە بازاڕ بە تەنها ).

### ٤. زیادەڕۆیی مەکە لە خەرجیدا و پارە بەفیڕۆ مەدە:

تەماشای باری دارایی و داهاتی هاوسەر، یان باوکت بکە و بەپێی ئەوە خەرج بکە، هەرگیز زیادەڕۆ و بە فیڕۆدەر مەبە، هەندێك ئافرەت هەر ئەوە دەزانن شت بکڕن و خەرج بکەن، ئیتر نالێن پێویستیانە یان نا، ئەم جۆرە ئافرەتە یەکێکە لەم دوو کۆمەڵە:

یەکەم: خوای گەورە ڕزقی داوە، ئیتر وا دەزانن ئەم خەرجکردنە دەرخستنی ئەو نیعمەتەیە، نازانێت ئیسراف و بەفیڕۆدانە، ڕەچاوی حەقی خوا ناکات لە ماڵی خۆی و مێردەکەیدا.

دووەم: ئافرەتێکە حەزی بە ڕواڵەت و خۆ دەرخستنە، تەنانەت ئەگەر هاوسەرەکەشی نوقمی قەرز بکات، گوێی لێ نییە چ بارێکی قورس دەکەوێتە سەرشانی مێردەکەی، گرنگترین شت لای ئەو ڕواڵەتە ئەگەر گیرفان و دەستیشی بەتاڵ بێت!!

هیچ کات بیر لە باری دارایی دەکەیتەوە لەو شتانەی دەیکڕی؟ بەزەییت بە خۆت و مێردەکەتدا بێتەوە، هیچ پێویست نییە ماڵەکەت وەك بازاڕ لێ بکەیت هەرچی شتە تێیدا بێت، هیچ شتێك مەکڕە پێویست نەبێت.

قراد بن نوح دەڵێت: (شعبە بن الحاج) کراسێکی بینی لە بەرمدا، وتی: بەچەند کڕیوتە؟ وتم: هەشت درهەم، وتی: باشتر نەبوو کراسێکت بکڕیایە بە چوار درهەم و چوار درهەمەکەی ترت بکردایە بە خێر؟!!

### ٥. هاوسەرەکەت ئاگادارکە:

ئەگەر دەزانیت هاوسەرەکەت ڕازی نییە بچیتە دەرەوە بۆ بازاڕ، پرسی پیّ بکە، ئەگەر پرسی پیّ نەکەیت، چونکە ئەگەر چوویت و ئەو نەیزانی و بە دزییەوە پرست پیّ نەکرد ئەوا تاوانباریت، هەر هەنگاوێك تاوانە، ئەوە تاوانت کردووە لە هەقی خوا و هەقی مێردەکەشت، چونکە خوای گەورە فەرمانت پیّ دەکات بە گوێڕایەڵی لە ماڵ بێت، یان لە ماڵ نەبێت، ئەگەر گوێڕایەڵیت نەکرد بەر تووڕەیی و خەشمی خوای پەروەردگار دەکەویت.



## وەرزی پانزەیەم

# ئافرەت لای ئێمە و لای ئەوان

لەوانەیە ڕۆژانە گوێبیستی ئەوەبین لە ڕاگەیاندنەکانەوە کە دەوترێت: توندوتیژی دژی ئافرەتان دیاردەیەکی ڕۆژهەڵاتییە، یان وردتر بڵێین: سەرچاوەکەی ئیسلامە.

بە داخێکی زۆرەوە هەندێك باوەڕ بەم درۆودەلەسە و پڕوپاگەندانە دەکەن، شانازی بە درۆی ئازادی و پاراستنی مافی مرۆڤ لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوادا دەکەن، کاتێك باس لە زانستی سروشتی و مرۆڤایەتی دەکرێت ناوی مسوڵمانان ناهێنن کە لە سەرەتادا دۆزیویانەتەوە، بە دەگمەن نەبێت، هەمووی دەدەنە پاڵ شارستانێتی ئەوروپای نوێ، بەڵام کاتێك باس لە شکاندنی مافی مرۆڤ و پاکتاوی ڕەگەزی و دینی دەکەن، ناگەڕێنەوە بۆ ئەو جینۆساید و لەناوبردنە بە کۆمەڵەی بەرامبەر بە سەدان هەزار مسوڵمان لە ئەندەلوس ڕوویدا، تەنانەت چەند ساڵ لەمەوبەریان بیر نایەت لە بۆسنە و هەرسك چی ڕوویدا؟ لە کوشتنی بەکۆمەڵ و دەستدرێژی بۆ سەر ئافرەتان.

## ١. دیاردەی توندوتیژی دژی ئافرەتان:

مەبەست لە توندوتیژی هەر لێدان و ئازار و ئەشکەنجە و مامەڵەیەکی خراپە کە ڕووبەڕووی ئافرەت دەبێتەوە، یان زۆر لێکردنی بۆ کارێك کە خۆی ویستی لەسەر نییە، (هەموو جۆرە توندوتیژییەکی جەستەیی و دەروونی و دەستدرێژی و خراپە مامەڵەکردن و لاقەکردن و کاری داوێن پیسی پێکردن)، لەسەر دەستی تاکەکەس بێت، یان بە کۆمەڵ، دەچێتە چوارچێوەی توندوتیژی دژی ئافرەت.

هەموو ئەوانەی لە (بۆسنە) ڕوویداوە یان لە زیندانەکانی عێراق بە دەستی داگیرکەر، هەر لە دەستدرێژی سێکسی و سوکایەتی و ئەشکەنجەیەك، باشترین بەڵگەن بۆ سوکایەتی کردن بە کەرامەتی ئافرەت لە ژێر سایەی سیستمی ڕۆژئاوادا، کە ئەگەر خۆشیان پێی هەڵنەستابن ئەوا تەماشاکەربوون و بە بەرچاویانەوە کراوە، مەترسیدارترین ئەو توندوتیژییانە بازرگانی کردنە بە ئافرەتانەوە لە وڵاتە پێشکەوتووکاندا، کە ئەم جۆرە بەربڵاوترین جۆری تاوانە، بەپێی ئاماری نەتەوە یەکگرتووەکان هەموو ساڵێك زیاتر لە(٧٠٠) هەزار ئافرەت بازرگانییان پێوە دەکرێت، بەشێوەیەکی قێزەون بەکاریان دەهێنن، هەر پاڵ پشت بە بەیاننامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، سێ بەشی ئافرەت(٣/٤) لە جیهاندا ڕووبەڕووی توندوتیژی دەبنەوە، کە کاریگەرییەکەی بە جەستە و دەروونیانەوە دەردەکەوێت، وا زۆرینەیان پەنا بۆ مەی و ماددەی بێهۆشکەر دەبەن، ئامارە فەرمییەکان لە ئەمریکا ئاماژە بەوە دەکەن: لەهەر پانزە چرکەیەکدا ئافرەتێك

ڕووبەڕووی لێدان دەبێتەوە و ساڵانە (٧٠٠) هەزار ئافرەت ڕووبەڕووی دەستدرێژی سێکسی دەبنەوە، ژمارەی ئەو ئافرەتانەی لەو وڵاتەدا لەلایەن هاوسەرەوە ڕووبەڕووی لێدان و توندوتیژی سێکسی دەبنەوە بە (٨١) ملیۆن مەزندە دەکرێت، لە فەڕەنسا توێژەران دەڵێن:٩٥٪ قوربانییەکانی توندوتیژی ژنانن.

لە کەنەدا٦١٪پیاوان توندوتیژی بەکاردێنن دژی هاوسەرەکانیان. لە (هیند)یش لە هەر (١٠) ئافرەتێك (٨) یان قوربانی توندوتیژین.. (٤٠٪) ژنانی هیند ڕووبەڕووی لێدان و دەستدرێژی سێکسی دەبنەوە.

لە(پیرۆ) ٧٠٪ ئەو تاوانانەی لە پۆلیس تۆمارکراون ئافرەتانی قوربانی دەستی مێردەکانیانن، ئەمە جگە لەو سوکایەتی و شکاندنی کەرامەتەی بە ئافرەتان دەکرێت، لەژێر ناو و نیشانی تردا هەر لە هەڕەشە لێکردن و فریودان و نمایشکردنیان لە کەناڵە بەدڕەوشتییەکان، کڕین و فرۆشتن پێیانەوە بە ملیۆنان دۆلار بەناوی ئازادی سێکسیەوە، لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە لەو مناڵانەی بەهۆی زیناوە دروست دەبن و لەناو دەبرێن، تا ئێستا (٦٠) شەست ملیۆن کچ لەناوبراون و مافی ژیانیان لێسەندراوەتەوە بەهۆی لەباربردنەوە، دەی ئایا ئیسلام لەباربردنی حەرام نەکردووە؟!

❋❋❋

## ٢. توندوتیژی خێزانی:

توندوتیژی خێزانی چەند شێوازێکی هەیە لە جەستەیی وەك لێدان و شەق، یان دەروونی: سوکایەتی پێکردن، ترساندن، بەکەم تەماشاکردن و زەلیل کردن .

(ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی) لە ڕاپۆرتێکدا دەڵێت: یەك ملیار ئافرەت لە ژیانیدا بۆ یەك جاریش بێت ڕووبەڕووی لێدان و بەزۆر سێکس کردن و ئازاری تر دەبنەوە، لە ئەمریکا لەهەر پانزە چرکەیەك ئافرەتێك بەدەستی مێردەکەی یان هاوڕێ پیاوەکەی ڕووبەڕووی لێدان دەبێتەوە. لە وڵاتی (کەنەدا) ساڵانە (٦١) ملیار دۆلار خەرجی توندوتیژی دژی ژنانە، لەوانە چاودێری پزیشکی و زیانی وەبەرهێنان .

لە(نیوزلاندا) ٢٠٪ی ژنان ڕووبەڕووی لێدان، یان ئازاردان دەبنەوە بەدەستی هاوسەر، یان هاوڕێ پیاوەکانیان.

لە (ڕوسیا) (٣٦) هەزار ئافرەت ڕۆژانە بەدەستی هاوسەر یان هاوڕێکانیانەوە لێیان دەدرێت.

لە (ئیسپانیا) بەپێی ڕاپۆرتی ساڵی(٢٠٠٠) لەهەر پێنج ڕۆژدا ئافرەتێك بەدەستی هاوڕێکەی دەکوژرێت.

لە (بەریتانیا) بەپێی ئاماری ساڵی (٢٠٠٢) لەهەر هەفتەیەکدا دوو ئافرەت بەدەستی هاوڕێ پیاوەکەی دەکوژرێت.

ئەمە ئامار و ژمارەی ئەوانە کە سەرسپی دەکەیت بە بیستنیان، ئەی درۆ و پڕوپاگەندەکانیان کوا بۆ سەر ئیسلام کە دەڵێن: ئیسلام لێدان و سوکایەتی ئافرەت بەڕەوا دادەنێت؟! ئەی تەماشای ئەو

ڕاستییە ناکەن؟ یان دڵتان قوفڵی لێدراوە و چاك و خراپی خۆتان نازانن؟! هیچ ڕاستییەك نابینن لەتاو ڕقیان بەرامبەر ئیسلام!

### ٣. توندوتیژی سێکسی:

دەستدرێژی توندترین شێوازی توندوتیژی سێکسییە، پەیوەستە بە سکپڕی نەخوازراوەوە، هەروەها ئەو نەخۆشییە بێ چارەسەرە مەترسیدارانەی دەرهاویشتەی ئەم کردارە قێزەونەیە، لەوانە نەخۆشی (ئایدز). بێگومان ئەو ئامارانەی لەسەر دەستدرێژی سێکسی هەن ئامارێکی ورد نین، چونکە حاڵەتە ڕاگەیەندراوەکان زۆر کەمترە لەوەی کە ڕوو دەدەن، بەهۆی نەچوونی ئابڕوو و ناوزڕاندنەوە دەشاردرێنەوە و هیچ سکاڵایەکیان لەسەر ناکرێت، لە جیهاندا لە هەر پێنج ئافرەتێك یەك ئافرەت دەستدرێژی دەکرێتەسەر، یاخود هەوڵی دەستدرێژی کردنە سەری دەدرێت. لە ئەمریکادا لە هەر(٩٠) چرکەیەکدا ئافرەتێك دەستدرێژی دەکرێتەسەر (بەپێی ڕاپۆرتی وەزارەتی دادی ئەمریکا لەساڵی ٢٠٠٠).

لە وڵاتی فەرەنسا ساڵانە(٢٥٠٠) ئافرەت ڕووبەڕووی دەستدرێژی سێکسی دەبنەوە.

### ٤. ئافرەت و جەنگەکان:

توندوتیژی دژی ژنان لە ڕێگای ناکۆکی و جەنگەکانەوە بووە بە پەتایەکی بەربڵاو، زۆربەی جار دەستدرێژی بە کۆمەڵ وەك چەکێك لە

شەڕەکاندا بەکاردەهێنرێت. بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی (ڕێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ) لە عێراقدا و لە ماوەی جەنگی ئەمریکادا لە نیسانی (٢٠٠٣) (٤٠٠) چوار سەد کچ لە بەغدا کە تەمەنیان لە هەشت ساڵ زیاتر نییە دەستدرێژییان کراوەتەسەر.

لە (بۆسنە و هەرسك) لەماوەی پێنج مانگدا و لەساڵی(١٩٩٢) کاتی داگیرکردنی ئەو وڵاتە، بیست هەزار بۆ پەنجا هەزار ئافرەت دەستدرێژییان کراوەتەسەر، لە هەندێك دێهاتی (کۆسۆفۆ) (٢٠٪-٥٠٪) لە ئافرەتان بە دەستی هێزەکانی سڕبیا ڕووبەڕووی دەستدرێژی بوونەتەوە. (بەپێی ڕاپۆرتی ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٩٢) لەسەر دەستی کێ ئەم کارە وەحشییانە ڕویداوە؟! ئایا لەسەر دەستی ئەوروپییەکان نەبووە؟!لەبەر چاو و گوێی جیهاندا نەبووە لەناویاندا وڵاتە پێشکەوتووەکان؟!

## ٥. وڵاتان پشتگیری قوربانییەکانی توندوتیژی دژی ژنان ناکەن

ئەمە ڕاپۆرتی ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی دەیڵێت، لە کاتێکدا بەشێکی زۆری ئەو تەندوتیژییانە هەروا بەسەریدا دەڕۆن و ڕاناگەیەنرێن هەر بەپێی ئەو ڕاپۆرتە، هۆکاری جیاواز هەیە کە ڕێ لە ژنان دەگرێت ڕووداوەکانی توندوتیژی بشارنەوە و باسی لێوە نەکەن، لەوانە: ترسی تۆڵەکردنەوە، نەبوونی هۆکاری ئابوری، سۆز، ترس لەسەر منداڵەکانی، بەدەست نەهێنانی قەرەبوو، بێ ویژدانی.

لە ئەمریکا تەنها(١٦٪)ی ژنان پۆلیس ئاگادار دەکەن لە ڕووداوی دەستدرێژی کردنە سەریان، لەوانەیە نیوەی زۆرتری ئەوەی کە ناچێتە پۆلیس گەر بێتو دڵنیا بکرێتەوە لەوەی کە ناوەکەی بڵاوناکرێتەوە سکاڵا تۆمارکەن، بەپێی ئاماری (٢٠٠٣) تەنها (١٣٪)ی ژنان لە بەریتانیا پۆلیس ئاگادار دەکەن لە دەستدرێژییەکانی سەریان.

## ٦. نەبوونی سزا لەسەر توندوتیژی

زۆربەی توندوتیژی دژی ئافرەتان بەبێ هیچ بەربەست و سزایەك دەڕوات، لە زۆربەی وڵاتاندا هیچ یاسایەك نییە بۆ ئەو مەبەستە، لە ساڵی (٢٠٠٣) (٧٩) وڵات لانی کەم هیچ یاسا و دەستورێکیان نەبووە بۆ دژایەتی توندوتیژی خێزانی. لە توێژینەوەیەکی (دەزگای پزیشکی مرۆڤایەتی فەرەنسا) کە حەوت ساڵی خایاندووە دەرکەوتووە کە (٥١٪) تاوانی کوشتنی ژنان هاوبەشەکانیان تاوانبارن، (هاوڕێ یان هاوسەر)وە، هەروەها مانگنامەی (جیهانی دیبلوماسی) کە لە ئۆکتۆبەری (٢٠٠٤) دەرچووە چەند ئامارێکی ترسناك دەخاتەڕوو، لەوانە:

- لە ئەڵمانیا لە هەر چوار ڕۆژدا (٣) سێ ژن دەکوژرێن.
- لە ئینگلتەرا لە هەر سێ ڕۆژدا ژنێك دەکوژرێت.
- لە فەرەنسا لەهەر پێنج ڕۆژێکدا یەك ژن دەکوژرێت، واتە لە مانگێکدا شەش ژن.

- له ئیسپانیا توندوتیژی خێزانی دەبێتە هۆی کوشتنی یەك ژن لەهەر چوار ڕۆژێکدا.

ڕاپۆرتی ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی دەڵێت: شەڕی ئەمڕۆمان دانانی سنورێکە بۆ توندوتیژییەکانی دژی ژنان، چونکە ئێستا قوربانییەکانی توندوتیژی خێزانی لە ئەوروپا (٦٠٠) شەش سەد ژن گیانیان لەدەست دەدەن، بەهۆی ئەو بەڵا و نەهامەتیانەوە. واتە بەڕێژەی دوو ژن لە ڕۆژێکدا.

شیاوی باسە توندوتیژی خێزانی هەموو چین و تاقمێك دەگرێتەوە بێ جیاوازی، بەجۆرێك دەستدرێژکار بەزۆری لە ئاستی زانکۆ و پێگەی کۆمەڵایەتی دیار و بەرزن، تەماشای دۆخی ڕۆژئاوا بکەن گەشتۆتە چ ئاستێك: بەرزبوونەوەی ڕێژەی سکپڕی هەرزەکاران لە دەرەوەی هاوسەرگیری، کە بە (دایکانی هەرزەکار) ناودەبرێن، واتە: خوار تەمەنی(١٨) ساڵ و (١٥) ساڵ، زیادبوونی ڕێژەی ئەو هەرزەکارانەی لەگەڵ زیاتر لە پیاوێك پەیوەندی سێکسییان هەیە، بڵاوبوونەوەی دیاردەی منداڵی زۆڵ (بێ دایك و باوك) و ئەو پەیوەندییە ناشەرعییە ئەوەندە پەرەی سەندووە بۆگەنی کردووە و ئێستا بەدوای لادان لەوەدان و شێوازی شاز وەك هاوڕەگەزبازی و....هتد.

بەداخەوە دووری لە دینی پیرۆزی ئیسلام و پەیڕەونەکردنی شەرع و چاولێکەری ڕۆژئاوا وای کردووە لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا ئەم نەهامەتییانە دووبارە بکرێنەوە.

لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە (٣٣٪)ی ژنانی تونس و (٣٤٪)ی میسر و (٥٤٪)ی فەلەستین ڕووبەڕووی توندوتیژی خێزانی دەبنەوە.

## ٧. لەباربردن، پەتایەکی جیهانی

لەباربردن بووە بە پەتایەکی بەربڵاوی جیهانی، بەجۆرێك ئامارەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ئاماژە بەوە دەکەن: ساڵانە (٤٦) ملیۆن ئافرەت لە نێوان تەمەنی (١٥–٤٠) ساڵی منداڵ لەباردەبەن، ئەمەش دەکاتە (٢٢٪)ی ئەو (٢١٠) ملیۆن سکپڕییەی ساڵانە دروست دەبن، هەر ئەو ئامارانە ئەوە دەخەملێنن (٢٦) ملیۆن حاڵەتی لەباربردن بە شێوازی فەرمی ئەنجام دەدرێت، لە بەرامبەردا (٢٠) ملیۆن حاڵەت بە نافەرمی دەکرێت.

بۆیە هەژماری ڕێژەی لەباربردن لەو وڵاتانەی لەباربردن قەدەغەیە قورسترین کارە، بەرزترین ڕێژەی لەباربردن لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپایە، بەجۆرێك لە هەموو هەزار ژنێك (٩٠) حاڵەتی لەباربردن ڕوودەدات، بەڵام لە وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا لە هەزار ئافرەت (١١)یان ئەو کارە ئەنجام دەدەن. لە ئەمریکا ڕێژەی لەباربردن (٣٩) حاڵەتە لە هەزار ئافرەتدا، ئەم ڕێژانەش بەزۆری لە پەیوەندی ناشەرعی و دەرەوەی هاوسەرگیری ڕوودەدەن.

❊❊❊

### ٨. ئافرەت و ئایدز:

کۆتا ڕاپۆرتی (unifem) (یونی فێم) دەڵێت: بەڕێژەی (٥١٪)ی هەموو ئەوانەی تووشی ئایدز بوون ژنانن، واتە زیاتر لە (٢٠) ملیۆن ئافرەت تووشی ڤایرۆسی ئایدزن، ڕێژەی(٥٥٪)ی لەو(١٦) هەزارەی ڕۆژانە تووشی ئەو ڤایرۆسە دەبن لە ڕیزی ژنانن.

نەخۆشی ئایدز بە یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی مردنی ژنان دادەنرێت، کە تەمەنیان لە نێوان (٢٠–٤٠) ساڵیدایە لە ژمارەیەك لە وڵاتانی ئەورووپا و باشوری بیابانی ئەفریقا و ئەمریکای باکور.

ساڵانە(٥) پێنج ملیۆن کەس بەو نەخۆشیيانەی پەیوەندییان بە ڤایرۆسی ئایدزەوە هەیە دەمرن، وا زانراوە ئەو نەخۆشییە ترسناکە لە نێوان ئەوانەدا ڕوودەدات کە لادانی سێکسی و پەیوەندی ناشەرعی سێکسی لەگەڵ توشبوودا ئەنجام دەدەن.

### ٩. ئایا دەزانیت؟

– ڕۆژانە (١٩٠٠) کچ لە ئەمریکا دەست درێژییان دەکرێتەسەر، کە لە(٢٠٪)یان لەلایەن باوکیانەوەیە.

– ساڵانە یەك ملیۆن مناڵ بە لەباربردنی بە ئەنقەست دەکوژرێن.

– هەفتانە لە بەریتانیا (١٧٠) کچ بەهۆی بەدڕەوشتییەوە دووگیان دەکرێن.

– لە ئیسپانیا پۆلیسی ئەو وڵاتە لە یەك ساڵدا (٥٠٠) هەزار دەست درێژی جەستەیی تۆمارکردووە.

- ئامارەکانی ئەمریکا ئاماژە بەوە دەکەن کە (٦) ملیۆن ئافرەت هەموو ساڵێك ڕووبەڕووی لێدانی توند بوونەتەوە.

- لە ئەمریکا (٨) ملیۆن ئافرەت لەگەڵ منداڵەکانیان بە تەنها دەژین بەبێ هیچ یارمەتییەك، یەك ملیۆن ژن لەماوەی (١٠) ساڵدا کاری لەشفرۆشییان کردووە.

ئەی کوا ئەو مافی ئافرەتەی ڕۆژئاوا بانگی بۆ دەدات؟ کوا ئازادی؟ کوا ڕێز و کەرامەتی ئافرەت؟!

لەسەرووی هەموو ئەمانەوە دەیانەوێت ئافرەتی موسوڵمانیش وەکوو ژنانی خۆیان ڕووت و بەڕەڵاو بێ سەر و بەر بێت، مەی بخواتەوە و مەیگێڕ بێت، یان بە ڕووتی لە کەناراوەکاندا بێت. بێگومان ئاسانترین ڕێگا بۆ زاڵبوون بەسەر کۆمەڵگەکاندا بێ ڕەوشتکردنی ئافرەتەکانیەتی، ئازادکردنیان وەك نووسەرەکانیان دەڵێن (٥٩٪)ی پیاوی ئەمریکا لە ژنەکانیان دەدەن، (٣٧٪)ی ئافرەتی بەریتانیا بەهۆی ئافرەت، یان بۆی فرێندەوە لێیان دەدرێت.

لە فەرەنسا ساڵانە یەك ملیۆن ئافرەت ڕووبەڕووی لێدان دەبنەوە!! ئەی ئەمە لە کوێی شەرعی ئیسلامدایە کە هێرشی دەکەنە سەر؟! ئەوان دەڵێن: قورئان باس لە لێدانی ئافرەت دەکات!! ئایا ئەوان ئەگەر پەیڕەوی قورئان دەکەن وا دەکەن؟!



## ١٠. لێدانی هاوسەر (ژن) لە ئیسلامدا:

بەڕێز شێخ محمد غەزالی دەڵێت:

(هیچ بەڵگەیەکی شەرعیم نەدیوە کە ڕێ بە لێدانی ژن (هاوسەر) بدات، تەنها لە دوو حاڵەتدا نەبێت:

١- نشوز (یاخی بوون و بەلەسەبوونی ژن لە مێردەکەی). مانای گشتی ئەم وشەیە واتە خۆگەورەکردن و بەرزکردنەوە بەسەر هاوسەردا، وەیاخی بێت و مل نەدات بۆ داواکارییە شەرعییەکان، ئەمە پاڵی پێوەدەنێت بۆ ئەوەی تەنانەت پێی ناخۆش بێ و خۆی زۆر بەگەورەتر بزانێ، کە هەر پەیوەندییەکی بە مێردەکەیەوە هەبێ و نزیک بێتەوە لێی لە پێویستترین ئەرکی هاوسەرداریتیدا، شەو بمێنێتەوە و ڕۆژبکاتەوە بەو تورەییە و دڵ گران بێت لێی (هاوسەرەکەی).

٢- خراپەکار: پیاوی نامەحرەم بێنێتە ماڵەکەی کە هاوسەرەکەی پێی ناخۆشە، ببێتە هۆی دروستکردنی گومان و ناوزڕاندن و تێکدانی پەیوەندی هاوسەرێتی، لەگەڵ ئەمانەشدا ڕاڤەکاران هاوڕان لەسەر ئەوەی ئەو لێدانە تەمبێ کردن بێت تەنها بە پیاکێشانی سیواکێك بۆ نموونە، نەك لێدانی قورس و بە ئازار، هەروەها لە دەموچاویشی نەبێت.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (لە دەم و چاو مەدەن و مەڵێن خوا لە خێر بێ بەشت بکات، یا خوا ڕووت ڕەش بکات).

دواتر خوای گەورە لە ئاستی هاوسەرانی باش و ئەوانەی مافی خوا و مافی خێزانەکانیان بەجێ دێنن دەفەرموێت: ﴿فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ

عَلَيۡهِنَّ سَبِيلاًۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا﴾ النساء: ٣٤. واته: (ئەگەر لە یاخیبوون و ملنەدان وازیان هێناو گوێڕایەڵ بوون، ئیتر ئێوەش هیچ ڕێگایەکیتر مەگرنەبەر بۆ ئازاردان و ستەم لێکردنیان. بەڕاستی خوا بەرز و بڵند و گەورە و زانایە، هەر کەسێك دەستدرێژی بکات تۆڵەی دەسێنێت).

ئەم دوو سیفەتەی خوای گەورە لە کۆتایی ئایەتەکەدا هێناویەتی (علو، کبریاء) جێی تێڕامانە، ئەوە دوو سیفەتی پێچەوانە و دژی زیادەڕەوی لە خراپە و مامەڵەکردن و ئازاردانی بێ دەسەڵات و لاوازە، بۆیە سەرنجی پیاو ڕادەکێشێت بۆ ئەو دوو سیفەتە کە پێویستە مامەڵە و کرداریان لەگەڵ ماڵ و خێزاندا لە ئاستێکی بەرزدا بێت.

لەگەڵیدا نەرم و نیان و ڕەوشت بەرزی لەبیرنەکات، ئەمە ناکاتە ئەوەی پیاو وابزانێت هەر کات بیەوێت پەلاماری ژنەکەی بدات و ئیتر لە بەردەم خوادا لێی ناپرسێتەوە.

**لە سێ حاڵەتدا ئیسلام لێدانی هاوسەری بەدەستی مێردەکەی قەدەغەکردووە:**

أ- هیچ کات مێرد مافی ئەوەی نییە لە ژنە یاخییەکەی بدات، هەتا قۆناغی ئامۆژگاری و پشت تێکردن و جێهێڵان (هجر) بەرامبەری نەکات، کاتێك بەم دوو قۆناغە چاك نەبوو ئەمجا.

ب- ئیسلام نەهی کردووە لە لێدانی بە ئازار، واتە ببێتە ئەزیەت و عەیبدارکردن: (اضربوا نسائكم إذا عصينكم في معروف ضربًا غير

مبرح). (عطاء) دەڵێ پرسیم لە (ئیبن عەباس) مەبەست لە (ضرب غير مبرح) چییە؟ ئیبن عەباس وتی: بە سیواك یا هەر شتێك لەو جۆرە. (قرطبی)

ت- خوای گەورە نەهی کردووە لەوەی لێدانی تۆڵەسەندنەوەبێ، وەك دەفەرموێ: ﴿فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ﴾ النساء: ٣٤.

با ئەوەش بزانین پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نۆ هاوسەری هەبووە هیچ کاتێك لە کەسیانی نەداوە، بەڵکوو ڕقی لە لێدان بووە و بە ناقۆڵاو ناشرینی داناوە، بە ڕۆژ لە ژنەکەت بدەیت و بە شەو ڕووت هەبێ لەگەڵی کۆببیتەوە، دەفەرموێ: (بم يضرب أحدكم امرأته ضرب الفحل ثم لعله يعانقها). رواه البخاري. چۆن بە نێرێتی دەدەی لە ژنەکەت و دواتر لەوانەیە دەست لەملان و ئاوێزانی ببیت).

## ١١. ئەمە ڕێزلێنانی ئیسلامە، ئەی ڕێزی ئەوان کوا؟!

ئەمە لەکوێی شارستانی ڕۆژئاوادایە ئەو مافەی ئیسلام بە ئافرەتی داوە و ئەو ڕێزەی لە کچی ناوە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (هەر پیاوێك سێ کچ یان سێ خوشکی هەبێت، وە ئایا دوو کچ یان دوو خوشك، باش بێت لەگەڵیاندا و لەخوا بترسێت لێیان ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە). البُخاری.

وەك هاوسەریش ڕێزی لێناوە: وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (کەسێك ڕێزی ئافرەت بگرێت ڕێزدارە، کەسێك سوکایەتییان پێ بکات ئەوا لۆمە کراوە). البُخاری.

ئەمجا وەك دايك ڕێزی لێنراوە، لە وەڵامی ئەو پرسیارەی پیاوێك عەرزی دەكات پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: دەڵێت: كێ لەهەموو كەس لە پێشترە باشبم لەگەڵی؟ دەفەرموێت: دایكت، دەڵێ: دوای ئەو كێ؟ هەر دەفەرموێت: دایكت، جاری سێهەم هەر دەفەرموێت دایكت، بۆ جاری چوارەم دەفەرموێت: باوكت. واتە سێ جار ئەجری دایكی داوە بەسەر باوكدا. (متفق علیه)

ئەمە جگە لەو ئایەتانەی باسی چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوك و باسی زەحمەت و ڕێزی دایك دەكات. ڕۆژئاوا چاو لە ئەو واقیعە تاڵە دەنووقێنێت كە ئافرەتانی خۆی تێدایە، دێن ژنانمان بانگ دەكەن بۆ بەڕەڵایی و بێ ڕێزی بەناوی ئازادی و سەربەستییەوە؟! لە بیریان چووە لە هەموو بوونەوەردا نیزامێك نییە ڕێز و پێگەی ئافرەت تێیدا بەرز ڕاگیرا بێت جگە لە ئیسلام:

﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ﴾ البقرە:٢٢٨.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (النساءُ شقائقُ الرجال)، لەبارەی سوكایەتی پێكردن و لێدانەوە بەو كەسانە دەڵێت ڕسواو لۆمەكراو (ما أهانهنَ إلا لئيم)، وە بۆ هاندانی پیاو كە باش بن لەگەڵ خێزانیان، دەفەرموێت: (خيْرِكُم خيْرِكُم لأهلِهِ، وأنا خيْرِكُم لأهلي).

❁❁❁

١٢. (وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ)

ئافرەت پێش هاتنی دینی پیرۆزی ئیسلام کاڵایەکی بێ نرخ بووە لای خەڵکی، وەك ئاژەڵ مامەڵەی لەگەڵ کراوە.

گوێ بگرە لە فەرمایشتی الله جل جلالە: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ۝٥٨ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ۝٥٩﴾ النحل: ٥٨-٥٩.

واتە: (خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرایە بە یەکێك لەو نەفامانە، ڕووی گرژ و تاڵ دەبوو و ڕەش دادەگیرسا، سینەی پڕ دەبوو لە خەم و پەژارە لە داخ و خەفەتی ئەو مژدە ناخۆشە خۆی دەشاردەوە لە خەڵکی، بیری دەکردەوە ئایا بەو زەلیلی و سوکییە بمێنێتەوە، یان زیندە بەچاڵی بکات و بیکاتە ژێر خۆڵەوەو خۆی ڕزگار بکات لەو ڕیسواییە کە چەندە بڕیارێکی خراپ و ستەمکارانەیە).

دەگێڕنەوە یەکێك لە هاوەڵان بە ناوی (عبدالله بن المغفل) هەمیشە خەمبار و دڵتەنگ بوو، کە لە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دادەنیشت خەمۆکییەکی گەورەو خەمێکی زۆر بەدەم و چاویەوە دیاربوو.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لێی پرسی: کە هۆکاری ئەو خەمبارییەی چییە هەرگیز لێی نابڕێت؟ هاوەڵەکە وتی: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) من لەکاتی نەفامیدا (واتە: پێش ئیسلام)،

ژنەکەم دووگیان بوو، منیش سەفەرێکی دوورو درێژم هەبوو جێمهێشت، دوای چەند ساڵێك گەڕامەوە، زانیم هاوسەرەکەم کچی بووە و لەناو منداڵاندا یاری دەکرد زۆر جوان بوو، کچێکی جوان بێ گوناهو پاك و بێ گەرد، بەدڵخۆشی یاری دەکرد لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنیدا، بردم و وتم بە هاوسەرەکەم بیگۆڕە و بیڕازێنەرەوە، هاوسەرەکەم زانی دەیبەم دەیکوژم و زیندە بەچاڵی دەکەم.

هەستا گۆڕی و بەکوڵ دەگریا بەسەریدا زۆر خەمی بوو، دایەدەستم و وتی: پیاوەکە ئەو ئەمانەتە زایە مەکە، دواتر بەو جوانی و بەرائەتەوە بردم بۆ یەکێك لە دۆڵەکان بیرێك لەوێدا هەبوو، پێشتر بینیبووم گەڕام بیرەکەم دۆزییەوە هیچ ئاوی تێدا نەبوو، چوومە لێواری بیرەکە تەماشای کچەکەم دەکرد دڵم نەرم دەبوو لەو بێ گوناهی و بەرائەتەی، بەڵام دواتر بیری ئەو سەرشۆڕییەم دەکردەوە شوو بکات، یاخود بەدڕەوشت بێت، دڵم ڕەق دەبوو، ماوەیەك بەم دوو دڵییە مامەوە، دواتر هەموو هێزێکم کۆکردەوە و گرتم بەسەردا کردمە ناو بیرەکە، ڕاوەستام بزانم مردووە یان نا؟ دوای چەند ساتێك دەنگی هات هاواری دەکرد: باوکە ئەمانەتەکەت زایە کرد، هەر ئەمەی دەگووتەوە تا دەنگی نەما.. سوێند بەخوا هەر کە بیری لێدەکەمەوە سەرتاپام خەم دامدەگرێت و بۆ یەك ساتیش ئەو دیمەنەم لەیاد ناچێت. ئەڵێم خۆزگە هەر نەبوومایە.

ئەمجا تەماشای پێغەمبەری کرد (صلی الله علیه وسلم) دەبینێت فرمێسکەکانی ڕیشی تەڕکردووە و فەرموی: ئەی عبدالله، سوێند بە الله ئەگەر حەدم بدایە لە هەر کەسێك لەسەر کردەوەکانی پێش مسوڵمان

بوونی و کاتی نەفامێتی، حەدم لێ ئەدای لەسەر ئەو کردەوەت، بەڵام ئیسلام هەموو کردەوەکانی پێشتان دەسڕێتەوە.

### ١٣. پەروەردەی کچان:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بنەمایەکی نموونەیی داناوە بۆ پەروەردە و بەخێوکردنی کچ، پەروەردەکەی کردۆتە ئامرازێك بۆ ڕەزامەندی خوا، لەو فەرموودەیەدا کە لە خاتوو عائیشەوە دەگێڕێتەوە: (ئافرەتێك دوو کچی پێبوو، هات داوای شتی کرد، هیچ لەماڵەکەمدا نەبوو یەك دەنکە خورما نەبێت، دامە دەستی، ئەویش کردی بە دوو کەرتەوە و دایە هەردوو کچەکەی، خۆی هیچی لێ نەخوارد و دواتر ڕۆشتن. کاتێك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوە ماڵەوە، بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: ئەو بەو شێوەی کردووە بۆ کچەکانی، ئەو کارە دەبێتە قەڵغانێك بۆی و دەیپارێزێت لە ئاگر).

کەواتە باش ڕەفتارکردن و دڵسۆزی و بەزەیی بەرامبەر کچ دەتگەیەنێت بە ڕەزامەندی خوا و پاراستنت لە ئاگر.

لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کاتێك خوای گەورە (فاطمە)ی پێ دەبەخشێت، دەفەرموێت: (ڕەیحانەیەکی بۆنخۆشە بۆنی دەکەم (دڵخۆشم دەکات)وە ڕزق و ڕۆزی لەسەر خوایە). واتە: کچ پێ بە ڕزقە و ڕۆزی لە خواوەیە و بەشی خۆی لەگەڵدایە، (لە کوردەواری خۆشماندا لەم ڕوانگەیەوە کە دەڵێن: کچ نگینە، کە یەکێك تۆبەرەکەی کچ بێت. واتە سەربەڕزقە). (وەرگێڕ)

جا تەماشاکە چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کچ دەچوێنێت بە(ڕەیحانە) بۆ بۆن خۆشی و جوانی دیمەنەکەی، بەبۆنەکەی دڵ خۆش دەبێت و بە دەوروبەرەکەی بۆنی خۆش و جوانی دەبەخشێت، بەم جۆرە وەسفی کچ دەکات. با ئەو باوکانە ئەمە ببیستن کە ڕقیان لە بوونی کچەو کاتێك کچیان دەبێت ناڕەحەت و قەڵس دەبن، بزانن چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مژدەی دەدرێتێ بە بوونی (فاطمە)و دڵخۆش دەبێت پێی.

هەروەها ئیسلام دایك و باوك هان دەدات جوان ڕەفتار بکەن لەگەڵ کچاندا و نازیان بدەنێ و سۆز و بەزەییان بۆیان هەبێت و هەوڵ بدەن بۆ دابینکردنی ژیانێکی باش و سەربەرزانە بۆیان. وەك لە فەرموودەیەکدا خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (مَنْ كَانَ لَهُ ثلاث بَنات،فصَبر علي لأوائهن وَ ضَرائهن أدخله اللهُ الجَنّة برَحمتهِ إياهن). باش ڕەفتارکردن لەگەڵ کچدا و ئارامگرتن لەسەر هەر ناڕەحەتی و شەونخوونییەك دەیکات لەبەخێوکردنیان دا دەکاتە هۆکارێك بۆ چوونە بەهەشت.

جا لەوێدا پیاوێك پرسی ئەگەر دوو کچیش بێت؟ فەرمووی: بەڵێ دووانیش بێت. یەکێکیتر پرسی ئەگەر یەك دانە بێت؟ فەرمووی: بەڵێ یەك دانەش بێت.

### ١٤. ئەو بۆچوونانەی پێویستە ڕاستبکرێنەوە:

ئافرەت مرۆڤێکی خاوەن ڕێز و کەرامەتە، بە بەڵگەی فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ الإسراء: ٧٠.

هەموو نەوەکانی ئادەم (مرۆڤەکان) ڕێزلێگیراون بەژن و پیاوەوە.

بەڵام ئەوەی کە دەوترێت (ناقصات العقل) و (خلقت من ضلع)، ئەمانە خەڵك بە هەڵە تێگەیشتوون و هەرگیز لەگەڵ ئەو ڕێز و پێگەی ئافرەت نایەنەوە کە لە ئیسلامدا هەیەتی، ئەمە باس لە بوونیەی جەستەیی و پێکهاتەی ئەندامەکانی دەکات، نەك بەڵگە بێت بۆ کەمی ڕێز و پێگەی، چونکە ئەوە بە قورئان و سوننەت چەسپاوە کە چ ڕێزێکی هەیە، چۆن بەرپرسە وەك پیاو لە کردەوە مەدەنی و تاوانکارییەکان لە دونیادا: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً﴾ النحل: ٩٧. (پێشتر تەفسیری نووسراوە).

لە ڕووی تاوان و سزایشەوە وەك پیاوە: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ﴾ النور: ٢. واتە: (ئافرەت و پیاوی زیناکار هەریەکەیان سەد جەڵدەیان لێ دەدرێت، بێ جیاوازی).

- هەروەها مرۆڤێکی سەربەستە و کەسێتی خۆی هەیە، بە ئازادی و خواستی خۆی هاوبەشی ژیانی هەڵدەبژێرێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (لا تنكح الأيم حتي تستأمر، ولا تنكح البكر حتي تستأذن). البُخاری.

• هەروەها هەرکات حەزی لێی نەبوو وە نەیویست لەگەڵی بژی دەتوانێت لێی جیابێتەوە، ئەویش بە بڕیاری خۆی، یان بڕیاری دادوەر (قاضي)، هەرچی بۆ کردووە بیداتەوە، (خلع)ی پێ دەوترێت، وەك لە فەرموودەدا هاتووە: ژنەکەی (ثابت بن قیس)هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ثابت نە لەدین و نە لە خوو ڕەوشتدا خراپی نییەو ڕەخنەم لێی نییە، بەڵام حەزی پێ ناکەم و ناچێ بەدڵمدا، ئەترسم ئەمەش واملێبکات خراپبم لەگەڵی و مافی خۆی پێنەدەم و گوناهباربېم. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆری لێنەکرد ئەبێ هەتا ئاخری تەمەن لەگەڵی بێ، بەڵکوو فەرمووی: ئایا ئەو باخەی پێی داویت بۆی دەگەڕێنیتەوە؟ وتی: بەڵێ دەیگێڕمەوە بۆی، ئەمجا فەرمانی کرد بە جیاکردنەوەیان.

• ئافرەت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە مرۆڤێکی کامڵەو هاوبەشی پیاوە لە ژیانی خێزانیدا، کاتێك ئافرەت بەرگ و داپۆشەرە بۆ پیاو، پیاویش داپۆشەرە بۆ ئەو: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ البقره:١٨٧. هاوکار و پشتیوانی یەکترن لە بەرپرسیارێتی ماڵ و منداڵ و خێزانەکەیاندا: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُوا۟ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ﴾ النساء: ٣٤. واتە: (پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەکانیانەوە، ئەویش بەهۆی ڕێز و زیادە ئەرکێك کە خوا داویەتی بە هەندێك بەسەر هەندێکی تردا، وە بۆ ئەو ماڵ و سامان و خەرجی یەی کە دەیکەن).

- ئافرەت ئامادە دەکات بۆ بەڕێوەبردن و چاودێری مناڵ و کاروباری ناوماڵ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (ئافرەت بەرپرسیار و چاودێرە لەماڵی مێرد و مناڵەکانی). البُخاری.
- ئافرەت مرۆڤێکی پێگەیشتوو تێگەیشتووە و چالاکی کۆمەڵایەتی و بانگخوازی هەیە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ التوبه:٧١.

## ١٥. مافی ئافرەت لە خاوەنداریتیدا (موڵکییەت):

دینی پیرۆزی ئیسلام ئەم مافەی داوەتە ئافرەت بێ ئەوەی خۆی داوای بکات، بێ ئەوەی ڕێکخراوی بۆ ڕێکبخات و هاوار بکات و خۆپیشاندانی بۆ بکات، یاخود بچێتە پەرلەمان تا لەوێوە داوای مافەکانی بکات! ئافرەتی هاوسەردار لە ئیسلامدا کەسێتییەکی کامڵ و سەربەخۆیە.. سامان و موڵکی خۆی تایبەتە بە خۆی وە سەربەخۆ و جیایە لە کەسێتی مێردەکەی سەروەتەکەی، بۆ مێردەکەی نییە هیچ شتێك لەو ماڵ و موڵکەی بەرێت -کەم بێت یان زۆر- خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا﴾ البقره:٢٢٩. واتە: (بۆتان حەڵاڵ نییە هیچ شتێکیان لێ بسێننەوە لە مارەیی و ئەو شتانەی پێتان بەخشیون).

یاخود هیچ شتێك لەو ماڵ و موڵکەی خۆی بەبێ پرس و ڕەزامەندی نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن

طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ﴿٤﴾﴾ النساء:٤. واته: (مارەیی ئافرەتان بدەن بەو پەڕی دڵفراوانی و ئاسودەییەوە، خۆ ئەگەر بە ویستی خۆیان دەستیان هەڵگرت لە هەندێك مارەیی و بەخشییان بە ئێوە، ئەوا ئەو کات ئێوە بۆتان هەیە بیخۆن و بەکاری بهێنن و بێ دوو دڵی نۆشی بکەن). کەواتە بۆ هاوسەرەکەی نییە هیچ مامەڵە و تەسەڕوفێك بکات بەو ماڵ و دارایییەوە مەگەر خۆی ڕازی بێت و مۆڵەتی بدات.

## ١٦. بەڕاستی نەخشەو پیلانتان زۆر گەورەیە

لە قورئانی پیرۆزدا و لەسەر زمانی عەزیزی میسردا هاتووە: ﴿إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾﴾ یوسف:٢٨. بەڕاستی فێڵ و تەڵەکە و نەخشە و پیلانی ئێوە زۆر گەورەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾﴾ النساء:٧٦. واتە: (بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە)، ئەی ئایا ئافرەت فێڵ و تەڵەکەی لە شەیتان بەهێزترە؟

ئەگەر بە وردی بیخوێنینەوە ئایەتی دووەم باس لە فێڵی شەیتان دەکات لە بەرامبەر دەسەڵاتی خوادا، کەواتە لاواز و بچوك و هیچە، هەموو شتێك لە بەرامبەر خوای گەورەدا لاوازە، بەڵام لە ئایەتی یەکەمدا فێڵ و نەخشەی ئافرەت بەرامبەر فێڵی پیاوە، هۆی ئەوەی نەخشە و پیلانی ئافرەت بەرامبەر پیاو بەهێزترە ئەوەیە چونکە بە جەستە و هێزی جەستەیی لاوازە، بەڵام دەتوانێت بە فێڵ و نەخشە و پیلان ئەو لاوازییەی قەرەبوو بکاتەوە بەرامبەر پیاو و هێزەکەی هاوسەنگ بکات.

# وەرزی شانزەیەم بەرەو باوەڕێکی زیاتر

### ١. تاقیکردنەوەیەکی بەسام و تۆقێنەر:

زۆرمان ئەو حاڵەتەمان دیوە یان بەسەرمان هاتووە کاتێك وادەی تاقیکردنەوەی قوتابخانە نزیك دەبێتەوە، هەموو ئەو خێزانە دەکەونە خۆیان و حاڵەتی ئامادەباشی ڕادەگەیەنن، دۆخی ماڵەکە نا ئاسایی دەبێت تا ماوەی تاقیکردنەوەکان کۆتایی دێت.. ئەمە هەوڵێکی باشە و پاداشتی خێری هەیە ئەگەر نیەتەکان باش بن و مەبەست تیایدا خوای گەورە و ڕەزامەندی ئەو بێت.

بەڵام ئایا کێ لە ئێمە بەو جۆرە لە ئامادەباشیدایە بۆ ئەو تاقیکردنەوە بەسام و ترسناکەی کە خوای گەورە بۆ ئەوە دروستی کردووین! چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان ئەو دوو تاقیکردنەوەدا؟! تاقیکردنەوەی دونیایی لە کتێبێکی دیاریکراودا، یان زانستێکی چەند لاپەڕەییە، بەڵام تاقیکردنەوەی دواڕۆژ لە کتێبێکدایە کە هەرچی ورد و درشتی کردەوەکانمانە تیایدا تۆمارکراوە. خوای گەورە دەفەرموێت:
﴿وَيَقُولُونَ يَـٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَـٰذَا ٱلْكِتَـٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾﴾
الكهف:٤٩.

واتە: (کاتێك نامەی کردەوەکان دەدرێتە دەستیان دەڵێن: هاوار لە ئێمە ئەم نامە و دۆسیەیە چییە؟ هیچ شتێکی لەیاد نەچووە و ئەو خەڵکە هەرچیان کردووە بە (دەنگ و ڕەنگەوە) تۆمارکراوە و ئامادەیە، بێگومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە هیچ کەس ناکات).

بچوك نووسراوە و گەورە تۆمارکراوە هەرچی کردەوەی بەندەکان ﴿وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ ﴿٥٣﴾﴾ القمر:٥٣. هەرچی وردە درشتە نووسراوە تاقیکردنەوەی دونیا لە شوێنی ئامادەکراو و کورسی خۆش و فێنکایی، بەڵام تاقیکردنەوەی دواڕۆژ: کەشێکی تۆقێنەر، هەڵوێستێکی قورس ترس و بیمێکی گەورە دڵە لەرزە و نا ئارامی. ﴿يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾﴾ المزمل:١٧.

واتە: (منداڵ لەتاودا پیر دەبێت و سەری سپی دەبێت)، چاودێرەکان لە تاقیکردنەوەی دونیادا خەڵکانێکن وەك خۆت، بەڵام چاودێرمان لە تاقیکردنەوەی دوا ڕۆژدا کێیە؟! –ولله مثل الأعلى– ئەو کەسەیە نە شتی لێ ون دەبێت نە هیچی بیردەچێت، زانیاری هەیە بەسەر هەموو شتێکدا. تاقیکردنەوەی دونیا هەرچۆن بێت زەمانەتە و ڕێژەی دەرچوون زۆرە، بەڵام ڕێژەی دەرچوونی دواڕۆژ کەمە.

سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەی دونیا پلەیەك مرۆڤ بەرزدەکاتەوە، یان بڕوانامەیەك بەدەست دەهێنێت، بەڵام سەرکەوتن لە دواڕۆژدا دوورکەوتنەوەیە لە دۆزەخ و بەدەستهێنانی بەهەشت: ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾﴾

آل عمران:١٨٥. واتە: (ئەوەی دوورخرایەوە لە ئاگر و خرایە بەهەشتەوە، ئەوە بەڕاستی سەرفرازە، ژیانی دونیاش بێجگە لەوەی کە ڕابواردنێکی خەڵەتێنەرە هیچ شتێکیتر نییە).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (لە بەهەشتدا(١٠٠) نمرە هەیە خوای گەورە دایناوە بۆ تێکۆشەرانی ڕێگای خوا، نێوانی هەر دوو نمرەیەکی بەقەد نێوانی زەوی و ئاسمانە، ئەگەر داواتان کرد لە پەروەردگار داوای(فیردەوس)ی لێ بکەن کە لە ناوەڕاست و سەرەوەی بەهەشتدایە، سەرووی ئەو عەرشی ڕەحمانە، لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن). رواه البخاري.

کەوتن و دەرنەچوون لە تاقیکردنەوەی دونیا ئەوپەڕی لەدەستدانی پلەیەکە، یان دواکەوتنە لە قۆناغێکدا یان لەدەستدانی ئاست و پێگەیەکی دونیاییە، کەلەلای خوای گەورە نرخی باڵە مێشوولەیەکی نییە، بەڵام خەسارۆمەندی و کەوتن لە تاقیکردنەوەی ئاخیرەت خەسارۆمەندی هەمیشەییە بۆ ئەبەد: ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴾ الزمر:١٥.

واتە: (پێیان بڵێ: بێگومان خەسارەتمەندان ئەو کەسانەن خۆیان و خاو خێزانیان لەدەست چووە لەڕۆژی قیامەتدا، ئاگاداربن کە بەڕاستی هەر ئەوەیە خەسارەتمەندی ئاشکرا و زیانی دیار و ڕوون).

– لە تاقیکردنەوەی دونیادا ئەوەی خراپە کەوتن و دواکەوتنی تەنها ساڵێکە، ئەویش فرسەت هەیە جارێکیتر بتوانیت دەربچیت و

سەرکەوتوو بیت، بەڵام دواڕۆژ نە فرسەتێکیتر هەیە نە مۆڵەت و هەلێکی دووبارە، لەو کاتەدا دۆڕاو و خەسارۆمەندەکان هاوار دەکەن: ﴿رَبِّ ٱرۡجِعُونِ﴾ المؤمنون:٩٩.

پەروەردگارا بمگێڕەوە (بۆ دونیا)، بۆچی ئەی غافڵ و بێ ئاگا؟ ﴿لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ﴾ المؤمنون: ١٠٠. دەڵێ: (بەڵکوو چاکە بکەم و کاری باشە ئەنجام بدەم و ئەو هەلانەی لە کیسم چووە لەمەودوا لە کیسی نەدەم)، بەڵام ئایا بە قسەی دەکرێت و داواکارییەکەی جێبەجێ دەکرێت؟!

﴿كَلَّآۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَاۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾ المؤمنون:١٠٠. (نەخێر.. ئەوە ئەو وشەیەیە کە خوای گەورە دەیڵێت و (وەڵامیان دەداتەوە) دەبێت چاوەڕێ بیت لە جیهانی بەرزەخ لەنێوان مردن و زیندوو بوونەوەدا تا کاتی دیاریکراو).

کاتێك لە تاقیکردنەوەکە دەرنەچوون و بەدەست بەتاڵی مانەوە و هیچ هیوایەکیان بە گەڕانەوە نەما، چوونە دۆزەخەوە و تیایدا مانەوە جا هاوار دەکەن: ﴿وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ﴾ .

واتە: (ئەوانە قیژە و ناڵە و گریەو زاریان لە دۆزەخدا لێ بەرز دەبێتەوە دەڵێن: پەروەردگارا دەرمان بهێنە و ڕزگارمان بکە لەم حاڵە، (مەرج بێت) کارو کردەوەی چاك ئەنجام بدەین، نەك ئەوەی کە جاران دەمانکرد).

ئەمجا سەرزەنشت و سەرکۆنەکردن دەکرێن: ﴿أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ﴾ فاطر:٣٧. لەوەڵامیاندا پەروەردگار دەفەرموێت: (ئایا تەمەنێکمان پێ نەبەخشین تا لەو تەمەنەدا ئەوەی ویستی یاد بکاتەوە، مۆڵەتمان دانێ و بێدارکەرەوەشمان بۆ ناردن).

ئەمجا دیمەنەکە بەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار کۆتایی پێ دێت: ﴿فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ فاطر:٣٧. واتە: (دە بچێژن سزای سەختی دۆزەخ، بێگومان ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نییە بەرگرییان لێبکات).

## ٢. وریای دونیا بە:

زانایەك دەڵێت: ((هەر کەس بیر لە کۆتایی دونیا بکاتەوە ئاگادار دەبێت.. هەر کەس بزانێت ڕێگای دوور و درێژی لەبەرە، خۆی بۆ ئامادە دەکات، چەندە جێی سەرسامییە شتێك بزانیت و دواتر لەبیری بکەیت، یان لە خەڵکی بترسیت، لەکاتێکدا خوای گەورە لەپێشترە و حەقترە لێی بترسیت)).

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٧﴾ البقرە:١٩٧. واتە: (ئەگەر خەڵکی نیازمەندی دونیان، تۆ بەخوای خۆت نیازمەندبە، ئەگەر ئەوان بە دونیا دڵخۆشن، تۆ بە پەروەردگارت دڵخۆشبە، ئەگەر خەڵکی بە هاوڕێی

دونیاییان پەیوەستن دڵبەستەن، تۆ با خودا هاودەمت بێت و پەیوەست بە بەو زاتەوە، تەنها ئاتاجی خودابە و بۆ ئەو خۆت بچەمێنەوە، عیزەت و سەربەرزیت پێ دەبەخشێت، ئەگەر بینیتان خەڵکی سەرقاڵی دونیان ئێوە بە دوارۆژەوە خۆتان سەرقاڵکەن، کاتێك دەبینن خەڵکی بە ڕازاندنەوەی ڕواڵەتیانەوە خەریکن، ئێوە خۆتان بە ڕازاندنەوەی ناختان و دەروونتانەوە خەریك بکەن.. گەر دەبینن خەڵکی خەریکی ئاوەدانی باخ و بێستان و کۆشکەکانیانن، ئێوە هەوڵی ئاوەدانکردنەوەی ناو گۆڕتان بدەن).

- ئەگەر خەڵکی بەعەیب و عاری خەڵکەوە خەریکن، ئێوە بە عەیب و کەم و کورتی خۆتانەوە خەریکبن.
- لە دونیادا توێشوویەك کۆبکەرەوە بتانگەیەنێتە دوا ڕۆژ، دونیا کێڵگەی دوارۆژە.

لە خواترس و ڕاستگۆبە، دڵت لە خوا نزیك دەبێتەوە پیاوچاکان گریان پیشەیان بوو، برسێتی خواردن و بێ دەنگی قسەیان بوو.

شەو دەهات و ئەوان بێدار بوون، بای بەیان هەڵی دەکرد و ئەوان خەریکی زیکری خوا و تەوبەکردن بوون.

## ٣. لەخواترسی ڕاستەقینە:

لە خواترسی و خواناسی ڕاستەقینە، دڵ دابڕینە لە دونیا و خۆیەکلاکردنەوە بۆ قیامەت.

پێشەوا(ئیبن قەیم)چەندە جوان دەڵێت: (دڵ ئاڵۆز و پەراکەندەیە ڕووکردنە خوا نەبێت هیچ شتێك ڕێك و جەم و جۆری ناکات. دڵ ترسێکی تێدایە تەنها بە هاودەمیی خودا ئەو ترسە لادەچێت. خەم و تەنگییەکی تێدایە بە خۆشی ناسینی پەروەردگار نەبێت ناڕەوێتەوە.

نائارامی و پەشۆکاوی لە دڵدا بە کۆبوونەوە لەسەر زیکر و یادی خودا ئۆقرە دەگرێت، هەڵهاتن بەرەو پەروەردگار ئارامی دەکاتەوە).

پیاوچاکێك دەڵێت:

( دەرمان و چارەسەری دڵ لە پێنج شت دایە:

- خوێندنەوەی قورئان بە تێڕامانەوە.
- سك بەتاڵی(کەم خواردن).
- شەو نوێژ.
- پاڕانەوە لە بەرەبەیاندا.
- هاونشینی پیاوچاکان ).

## ٤. خۆت مەفەوتێنە بۆ دونیا:

گوڵزاری دونیا هەرچەندە پیایدا هەڵ دەدەیت و خۆتی پێوە ماندوو بکەیت هەر بەرەو نەمان و لەناوچوون دەچێت.

❖ ئەی ئەو کەسەی کە بە خۆشەویستی دونیاوە خۆت هیلاك و ماندوو دەکەیت، ئەی نازانی پاش ماوەیەکیتر تیادەچیت و دەفەوتێیت؟

❖ ئەی نازانیت هەر ڕۆژێك بێت ئەم دونیایە جێ دەهێڵیت؟

❖ کوان ئەوانەی لە تاوان و لوت بەرزیدا نقوم بووبوون، ئەی بەچی گەیشتن؟

❖ چەندە لە دونیادا هەوڵیاندا و بەرهەمیانهێنا، بەڵام نە هیچیان لەگەڵ خۆیان برد، نە دروێنە و بەروبوومێکیان پێبوو؟

خاوەنی هەموو دونیا بیت، لەناو گۆڕێکی تاریك و تەنهادا چی بە فریات دەکەوێت، کردەوە چاکەکانت نەبێت؟

❖ چەندەها کەس مردن لەناکاو یەخەی پێگرتن و نە مۆڵەتی گەڕانەوەیان هەبوو، نە هیچیان پێبوو؟ تەنها هەر ئەوەت پێدەگات کە پێش خۆتت خستووە و توێشووی قیامەتت بوون. ئیتر دەستەیەك چارەڕەش و بەدبەخت و دەستەیەك سەربەرز و بەختەوەر. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ٣﴾ الحجر:٣. واتە: وازیان لێ بهێنە با بخۆن و ڕابوێرن، هیوا و ئاواتەکانیان سەرگەرم و بێ ئاگایان بکات، سەرەنجام خۆیان دەبیننەوە (چییان بەسەردێت).

وە لە فەرموودەیەکی قودسیدا خوای گەورە دەفەرموێت: (سوێند بە عیزەتم هیچ کات دوو ترس و دوو ئەمن و ئاسایش لە بەندەیەکم دا کۆناکەمەوە.. ئەگەر لە دونیادا لێم ترسا ئەوا لە قیامەتدا ئەمنیەتی دەدەمێ و ترسی دەڕەوێنمەوە، ئەگەر لە دونیا لێم نەترسا و بێ باك بوو ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەیترسێنم). رَواهُ إبن حبان البيهقي.



## ٥. بیر لە بەهەشت و دۆزەخ بکەرەوە:

(عثمان بن عفان) هەرکات لەسەر گۆڕێك ڕادەوەستا ئەوەندە دەگریا ڕیشی هەمووی تەڕ دەبوو، پرسیاری ئەمەیان لێکرد و پێیان وت: باسی بەهەشت و دۆزەخ دەکرێت ناگریت، بەڵام لەسەر گۆڕ بەو جۆرە دەگریت؟ فەرمووی: گوێم لێبوو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو: ( گۆڕ یەکەم ماڵی دواڕۆژە، هەرکات لەویا ڕزگارت بوو ئەوا ئەوانیتر ئاسانترن، ئەگەر هاتوو قوتار نەبووی لێی ئەوا ئەوانەی دوای ئەو زۆر سەختترن).

(مجاهد) دەڵێت: یەکەم شت قسەت لەگەڵ دەکات گۆڕەکەتە، پێت دەڵێت: من ماڵی کرم و جانەوەرم.. من ماڵی ترسم.. من ماڵی تەنهاییم.. من ماڵی غەریبیم.. ماڵی تاریکیم.. من ئەمەم بۆ ئامادە کردوویت ئەی تۆ چیت بۆ من ئامادەکردووە ؟!

خواناسێك دەڵێت: ئەوەندە کار بۆ چوونە ئاگر بکە بەقەد ئەوەی بەرگەی دەگری.. ئەوەندە کار بۆ بەهەشت بکە بەقەد داواکارییەکانت لێی.



## ٦. بیر لە گەورەیی و دەسەڵاتی خوا بکەرەوە:

بیر بکەرەوە لە گەورەیی خوای گەورە لە دروستکراوەکانی، لە ئاسمانەکان، لە زەوی، لە دەریا و ڕووبارەکان چییان تێدایە لە بوونەوەران.

هەوڵ بدە هەمیشە لەگەڵی بیت، لەبیرت بێت، با ئەویش لەگەڵ تۆ بێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ الحدید:٤. واتە: (لەهەر کوێ بن لەگەڵتانە، بینەرە بە کارەکانتان).

هەوڵ بدە لەوانە بیت کە خوا خۆشی دەوێن، هەرکەس خوا خۆشی ویست، خێر و چاکە دێنێت بە بەریا و ڕێنمایی دەکات بۆ باشترینی کارەکان: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾﴾ المائدة:٥٤. تەماشاکەن دەفەرموێ: (تێکۆشان لەپێناو خوادا) خوای گەورە دەزانێت مرۆڤ بۆ گەیشتن بەو خۆشەویستییە بەرەنگاری هەموو لایەنەکانی ژیان دەبێتەوە، ئەوانەی فریوی دەدەن کە دەست بەرداری دینەکەی بێت، هەر لە وەسوەسەی دەروونی خۆی و خەڵەتاندن و لە خشتەبردنی شەیتان بۆی، بێگومان لەم ململانێدا تەنها ئەوانە سەردەکەون کە خوایان خۆشدەوێ و خوداش ئەوانی خۆشدەوێت.

ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەبیرخۆت بهێنە:

(سێ شت لەهەر کەسێکدا هەبێت تام و شیرینی باوەڕ دەچێژێت: خوداو پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) لە هەموو کەس و شتێك لەلا خۆشەویستر بێت، هەر چیت خۆش ویست لەبەر خوا خۆشت بوێت، پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ کوفر و بێ باوەڕی، دوای ئەوەی خوای گەورە ڕزگاری کردووە، هەر چۆن پێی ناخۆشە بکرێتە ئاگرەوە). متفق علیه.

سیفەتی یەکەم: واتە خۆشەویستی خوداو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دڵی ئیماندار داگیربکات، هیچ شتێکی لەوان لا بەڕێز و بەنرختر نەبێت، بێگومان خۆشەویستی خوا گوێڕایەڵی فەرمانەکانیەتی، خۆشەویستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شوێنکەوتنیەتی لەهەرچییەك پێی ڕاگەیاندووین.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ﴾ آل عمران:٣١. واتە: (ئەی پێغەمبەری خوا پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەو کاتە خوداش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت).

سیفەتی دووەم: خۆسەویستی بۆ خەڵکی خۆشەویستییەکی پاك و بێ گەردە لە هەموو هەوا و ئارەزوو و بەرژەوەندی و مەبەستێك.

سیفەتی سێیەم: حەزناکات بگەڕێتەوە بۆ کوفر و بێ باوەڕی، ئەمەش دامەزراوییە لەسەر مەبدەئو دەستگرتنە بە دینەوە کە بە هیچ شێوەیەك دەست بەرداری نابێت و بەهەر نرخێك بێت لێی لانادات.

ئەوە سومەییە دایکی عەماری کوڕی یاسر (ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) هەموو ئەندامی خێزانەکەی لەپێناوی بەرنامەکەی خوادا گیانیان بەخت کرد و شەهید بوون.. ئەبو جەهل هات بۆلای ئەم خاتوونە تا واز لە دینەکەی بهێنیت و بێ باوەڕبێت بە محمد (صلى الله عليه وسلم)، ڕەتی کردەوە و پێی وت: سوێند بە الله زمانم بە یەك وشەی کوفر پیس ناکەمەوە دوای ئەوەی خوای گەورە منی ڕزگار کردووە لێی، ئەویش یەك شمشێری لێدا و کوشتی و بوو بەیەکەم شەهیدی ئیسلام.

## ٧. دڵ و ئاوەز(عەقڵ)

هەمیشە دڵت با زیندوو و نەرم ساف و بێگەرد بێ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (خوای گەورە لە زەویدا دەفرو شوێنگەی هەیە کە دڵەکانە، خۆشەویسترینی ئەو دڵانە لای خوا، نەرمترینیان و پاکترینیان و توندترینیانە..) جا دواتر ڕوونی دەکاتەوە و دەفەرموێ: (نەرمترینیان بەرامبەر براکانیان، پاکترینیان لە گوناهو تاوان، توندترینیان لە زاتی الله). هەمیشە عەقڵ و ئاوەزت هۆشیار و تێگەیشتوو ئاگادار بێت پڕی بکە بەجۆرەها زانست و زانیاری.

پیاوچاکێك دەڵێت: (ئەگەر خەڵکی بە چاکەکاری لەخوا نزیك دەبنەوە، تۆ بە عەقڵت لێی نزیك بەرەوە).

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێت: (هیچ دەسکەوتێك بە قەد فەزڵی زانست بەسوود نییە کە ڕێنمایی و هیدایەتی خاوەنەکەی بکات بۆ ڕێگای ڕاست، یان لە خراپە و تیاچوون بیگێڕێتەوە).

چاوساغ و هۆشیار بە، بینایت بپارێزە چاوکراوە بە، چاوی ژیریت بە هیچ کوێر نابێتەوە بە تاوان و تەوبەنەکردن نەبێت.

خاوەن دڵە وریاکان کە بە یادی خوا زیندوون، هەمیشە لە ڕەزامەندی خوای پەروەردگاردان، چونکە (ڕازین بە الله کە پەروەردگاریان بێت، ئیسلام دینیانە، بە محمد (صلى الله عليه وسلم) کە پەیامبەریانە – (رَضَيتُ باللهِ رباً وَ بالأسلامِ ديناً وَ بمحمد رَسُول وَ نَبياً). ئەوان سوپاسگوزارن لەکاتی خۆشگوزەرانیدا، ئارامگرن لەکاتی بەڵا و نەهامەتیدا، ڕازین بە قەزا و قەدەری خوا.

## ٨. ئایا بەڕاستی ئێمە ئیمانداریـن؟!

یەکێك لە مامۆستا پیاو چاکەکان لە قوتابییەکانی دەپرسێت: ئایا ئێوە ئیماندارن؟

دەڵێن: بەڵێ ئیمانداریـن، سوپاس بۆ خوا .

مامۆستاکە دەڵێت: ئەی ڕاستی ئیمانەکەتان چییە؟

قوتابییەك دەڵێت: لەکاتی خۆشیدا سوپاسگوزاری خواین و ئارامگرین لەکاتی بەڵا و ناڕەحەتیدا، وە ڕازین بە قەزا و قەدەری پەروەردگار. مامۆستاکە دەڵێت: سوێند بە(رب الكعبة)ئیماندارن.

## ٩. چاکە و بەهێزی باوەڕ (التقوى و الإحسان)

باشترین پێناسە بۆ (تەقوا) بەهێزی باوەڕ و لەخوا ترسی ئەمە کە دەڵێت: (ألا يراكَ اللهُ حَيثُ نَهاك، وَألا يَفقدك حَيثُ أمرك). بەو شێوەی نەهی لێ کردووە نەتبینێت. واتە نەتبینێت بە خراپەکاری، ئەوەی فەرمانی پێکردوویت بیکەیت، لە فەرمانەکانی دەرنەچیت و دوورنەکەویتەوە لێی.

(ئوبەی کوڕی کەعب) لە حەزرەتی عومەر دەپرسێت (سەلامی خوایان لێ بێت) لە بارەی (تەقوا)و لەخوا ترسییەوە، دەفەرموێت: ئایا بە ڕێگای دڕکاویدا ڕۆشتوویت؟

دەڵێ: بەڵێ

دەفەرموێ: چیت کرد؟

دەڵێ: بەخێرایی ڕۆشتووم هەوڵم داوە و نەوەستاوم.

دەفەرموێ: ئا ئەوە تەقوایە.

هەمیشە گەورەیی خوای پەروەردگارت لە خەیاڵدا بێت لە هەموو کارێکدا کە پێی هەڵدەستی، پێش ئەنجامدانی و پاش ئەنجامدانی چاودێربە بەسەر خۆتەوە (الإحسان) چاکە و جوامێری، لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەپرسن لە بارەیەوە دەفەرموێت: (ئەوەیە کە بە شێوەیەك خوا بپەرستی کە ئەیبینیت، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینیت ئەو تۆ دەبینێت). رَواهُ مُسلم. کاتێك کارێك دەکەیت لە خۆت بپرسە: ئایا لەبەر ئەوە کردووتە شتێکت دەست کەوێت و خەڵکی مەدح و

سەنات بکەن؟ یاخود ئەوەی پاڵی پێوە ناوی بۆ ئەو کارە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا و وەرگرتنی پاداشتەکەی بووە؟

ڕەحمەتی خوا لە (حسن بەصری) کە دەڵێت:

(ڕەحمەتی خوا لەو بەندەیە لەسەر نیەتی خۆی دەوەستێت: هەر کارێك نیەتی بۆ خوا بوو دەیکات و نیەتی بۆ غەیری خوا بوو دوای دەخات).

پێشەوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نامە دەنووسێت بۆ یەکێك لە (والی)یەکانی: کاری پیاوێك بکە کە دەزانێت خوای گەورە کار و کردەوەی خراپەکاران چاکساز ناکات.

ئیمامی عومەر دەیزانی (تەقوا) لەخواترسی، تەقوای دڵە نەك جەستە، هەر کاتێك ئەو پارچە گۆشتە باش بوو هەموو ئەندامەکانیتر باش دەبن.

زانایان ئامۆژگاری یەکتریان دەکرد و بۆ یەکیان دەنووسی (هەر کەس نێوانی خۆی و خوا چاك بکات، ئەوا خوا نێوانی ئەو و خەڵکی چاك دەکات)، بە شەونوێژەکانت چێژی عیبادەت و بەندایەتی و لەخواترسی بچێژە، شیرینی یادی خوا بە قورئان خوێندن، چواردەورت فێری ئەوە بکە کە خوا فێری کردوویت، ئەوانە زۆر پێویستیان بە وشەیەکە باوەڕیان بەهێز و پڕبکاتەوە.

فەرموودەی پێغەمبەرت (صلى الله عليه وسلم) لەیاد بێت دەفەرموێت: (هەرچی لە منەوە فێر دەبن بیگەیەنن و بڵاوی بکەنەوە ئەگەر یەك ئایەتیش بێت). رَواهُ البُخاري.

پەنا بەخوا بگرە.. دڵت پاك بكەرەوە لە هەر خەوش و ژەنگێك. مانای بانگەواز ئەوە نییە کە دەبێت زانایەکی تەواو بیت تا بەو کارە هەستیت، نا بەڵکوو هەموو کەسێکی موسوڵمان شتێك لە دینی خوا بزانێت زانینێکی دروست و ڕاست، ئەوا واجبە لەسەری بیگەیەنێت بەکەسانیتر.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾﴾ فصلت:٣٣. واتە: (کێ لەو کەسە جوان گوفتارتر و قسە بەجێترە کە بانگەواز بۆ خوا دەکات).



## ١٠. وەرن با ساتێك باوەڕمان پتەوكەینەوە:

یەكێك لە پیاوچاكان دەڵێت: (یەكەم گۆڕەپانتان دەروونی خۆتانە كاتێك بەسەر ئەودا سەركەوتن، بەسەر هەموو ئەوانیتردا بەتوانا دەبن و سەردەكەون، ئەگەریش شكستیان هێنا ئەوا ئەوانی تریش ناتوانان و شكست دێنن، یەكەم جار تەقەلا و هەوڵتان لەگەڵ ئەو (نەفس)ە تاقی بكەنەوە).

بەڵێ، خوشكم وەرە با یادی خوا بكەین، سا بەڵكوو ببیتە ڕۆشنكەری ڕێگامان و هیدایەتمان بۆ ڕێگای ڕاست.

حەزرەتی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئەگەر سێ شت نەبوایە حەزم نە ئەكرد لە دونیادا بمێنم:

١. چێژی بێداری لە نیوە شەودا.
٢. لەگەڵ كۆمەڵێك دانیشم باشترین قسە هەڵبژاردە بكەم، وەك چۆن باشترین بەروبووم هەڵدەچنم .
٣. وە سواریی ئامادە بكەم بۆ جیهاد و جەنگ لە پێناوی خوادا)).

چەندە ژیانێكی خۆشە كە لە بەهەشتدا بیت و خوای گەورە لێت بپرسێت: ئایا ڕازیت بەو نیعمەتانەی پێت دراوە؟ دەڵێیت: چۆن ڕازی نەبم ئەوەی ویستوومە پێت داوم، هەموو ترسەكانم ڕەویونەتەوە و ئەمنیەت و ئارامیت پێ بەخشیوم.

دەفەرموێت: ئایا لەمە گەورەترت پێ ببەخشم؟ ئەمجا پەردەی نێوانتان لادەچێت و ڕووی پیرۆزی دەبینیت.. تەماشای دەكەیت ئیتر چاوەكانت لانادەیت بۆ سەر هیچ نیعمەتێكیتر تا تەماشای ئەو بكەیت،

بەڵام بزانە هیچ ناگاتە ئەو پلە و ئەو جێگایە بە بەرهەڵستی ئارەزوو و شەهوەتەکانت نەبێت: (حُفّت الجَنّة بالمكاره وَ حُفّت النّار بالشهَوات). البُخاري و المُسلم.

ئافرەتەکانمان لەکوێی ڕێبازی ئەم ئافرەتە چاکانەدان؟ لە کوێن ئەو ژنانەی دەکەونە سەرپێچی شەرعەوە لە جلوبەرگەکانیاندا، لە ڕوانینیاندا، ئەمجا ئەگەر ئامۆژگاریشیان بکەیت، دەڵێن: هەموو ژنان ئەمانە دەکەن و من کەی دەتوانم بە تەنها بووەستم لە بەرامبەریان.

ئەی کوا پابەندبوون و دامەزراوی لەسەر دینەکەت؟! ئەی کوا ئەو داماوە بەدبەختەی ڕوو وەردەگێڕێت لە بیستنی قورئان و گوێ لە گۆرانی بێ نرخ و زنجیرە تەلەفیزیۆنییەکان دەگرێت؟

## ١١. هەرگیز نائومێد مەبە لە ڕەحمی خوا:

ئیمامی شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت:

( هیچ مسوڵمانێك نییە فەرمانبەرداری خوا بێت و تاوان نەکات، هیچ مسوڵمانێکیش نییە تاوان و سەرپێچی فەرمانی خوا بکات و فەرمانبەرداری نەبێت ).

کەواتە مسوڵمان چەندە گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بێت ئەگەری تاوانکردنی هەیە، هەموو بەنی ئادەمێك تاوان دەکات، بەڵام باشترینیان ئەوانەن تەوبە دەکەن و داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەن.

دەگێڕنەوە قارون هەرچی خراپە بوو بەرامبەر موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) کردی، تەنانەت بەرتیلی دایە ئافرەتێکی

داوێن پیس کە بڵێت (موسا) زینای لەگەڵ کردووم (پەنا بە خوا)کاتێك بەنی ئیسرائیل کۆبوونەوە و موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) وەستابوو وتاری دەدا، ئەم ژنە هەستا و دەستی کرد بە لە قژ ڕنین و لورە لور و واوەیلا.

حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) وەستا لە قسەکەی (وتارەکەی) پێی وت: چییە؟ چیت بەسەرهاتووە؟

ژنەکە وتی: ئەوە (واتە موسا) زینای لەگەڵ کردووم، (موسا)سەلامی خوای لەسەر بێت واقی وڕماو وتی: سوێندت دەدەم بە خوا ئایا من کاری وام کردووە لەگەڵت؟ وتی: نا واللە. پێی فەرموو: ئەی کێ پارەی دایتێ وا بڵێیت؟

وتی: قارون.

حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) ئەم نزایەی کرد (اللّهم خذ قارون أخذ عزیز مقتدر)، قارون لە ماڵ و کۆشکێك بوو لە ئاڵتون خانووەکەی کەوتە سەر زەوی وێران بوو، قاچەکانی چەقی بوو بە زەویدا تا ڕا نەکات و نەیدەتوانی هەڵ بێت. ﴿فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ﴾ القصص:٨١.

واتە: (خۆی و ماڵ و سامانیمان برد بە ناخی زەویدا). تا ماڵەکەی تەواو چوو بە ناخی زەویدا هەر هاواری دەکرد: ئەی موسا، ئەی موسا.. موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) بێدەنگ بوو، وەڵامی نەدەدایەوە ویستی تۆڵەی لێبکاتەوە، هەتا بە تەواوی چوو بە ناخی

زەویدا و لەچاو دیارنەما. خوای گەورە بە موسای فەرموو: ئەی موسا چەندە دڵ ڕەق بوویت؟ بە عیزەت و جەلالی خۆم ئەگەر وەك ئەوەی هاواری لەتۆ کرد بە یەك وشەی ئەوە هاواری لەمن بکردایە ڕزگارم دەکرد.

هەمیشە لەیادت بێت خوای گەورە (بەخشندە و میهرەبانە)، ئەگەر گوناهێکت کرد خێرا داوای لیخۆشبوونی لیّ بکە و تەوبە و پەشیمانی بۆ دەربڕە، هەر سەرپێچییەکت کرد بیری سیفاتەکانی (الحی-القیوم) بکەرەوە.

(حسن) سەلامی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت: (ئیماندار کە تاوانێك دەکات هەر خەمۆك و غەمبار و چاو بەگریانە تا دەچێتە بەهەشتەوە).

(سعید بن جبیر) سەلامی خوای لەسەر بێت دەڵێت: (لەوانەیە یەکێك کە تاوانێك دەکات ئەو تاوانە هەر لە پێش چاوی بێت و لەبیری نەکات تا دەچێتە بەهەشتەوە). مەبەست لەوەیە ئەو تاوانەی پیّ ناخۆشە و ناڕەحەتە پێی، هەمیشە لە بیریایەتی و پەشیمانە لێی.

## ١٢. لێپێچینەوە لە خۆتان بکەن:

(وهب بن منبه) دەڵێت:

کەسی ژیر چوار کاتژمێر لە دەست خۆی نادات:

- کاژێرێك ڕازو نیاز لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بکات.
- کاژێرێك لێپێچینەوە لەخۆی بکات.

– کاژێرێك لەگەڵ ئەو برا و هاوڕێیانەدا بباتەسەر کە هەڵەکانی پێ دەڵێن و لە کەموکوڕییەکانی ئاگاداری دەکەن .

– کاژێرێکیش چێژ لە خۆشییە حەڵاڵەکانی وەرگرێت و حەرام نەکات، ئەم کاتژمێرە یارمەتیدەرە بۆ ئەو ساتانەی تر و وزە و توانای کۆدەکاتەوە و خۆی تازە دەکاتەوە .

چەندە جوانە ئەو وەسیەتەی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دەفەرموێ: (لێپێچینەوە لەخۆتان بکەن پێش ئەوەی لێپرسینەوەتان لەگەڵ بکرێت، هەروەها خۆتان کار و کردەوەکانتان کێش و پێوانە بکەن پێش ئەوەی بۆتان بکەن ).

خۆتان ئامادە بکەن بۆ ئەو ڕۆژەی هەموو شتەکان دەخرێنەڕوو، ڕۆژی دادگاییکردنی گەورە: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾ الحاقة:١٨.

واتە: (ئەو ڕۆژە ئیتر دەبرێن بۆ بەردەم دادگای حەق، هەموو شتەکان دەخرێنەڕوو، هیچ شتێکی نهێنی شاراوە نییە). ئەگەر لە نوێژەکانتدا کەمتەرخەم بوویت ئەوا سەرزەنشتی خۆت بکە بە خێر کردن بە پارە و تەوبە کردن.

ئەگەر سست و کەمتەرخەم بوویت لە سەردانیکردنی خوشك و برا و کەسوکارت، خێرا سزای دەروونی خۆت بدە بە ڕۆیشتن بۆ لایان و دژایەتی نەفس و ئارەزووەکان، چەند ڕکاتێك نوێژی سوننەت بکە بۆ ئەوەی نەفست تەمبێ ببێ و ڕابێت لەسەر لێپرسینەوە و چاودێری خۆی.. ئیماندار ئیمانەکەی وەك پشکۆی ئاگر بەدەستەوە دەگرێ و

دەستبەرداری نابێت، پێشبڕکێیانە بۆ کاری چاکە -لە بچووک و گەورە- لە هەموو شوێنێك و مەیدانێك بەشیان هەیە، لەهەر کوێ چاکە بێت لەوێ دەبن.

تۆ نازانی چ کارێکی خێر بەرەو بەهەشتت دەبات و دەبێتە هۆی بەختەوەری هەتاهەتاییت، لەوانەیە بڵاوکردنەوەی پەیامێکی ئامۆژگاری لەتۆڕەکان، یان قسەی خێر لە قوتابخانەکەتدا بتباتە بەهەشت.. یان یەك قسەی خێرت کردبێت بەوە خوای گەورە ڕەزامەندی و لێخۆشبوونی خۆی بۆ نووسی بێت.

لە هەموو ئەمانەش گەورەتر ئەوەیە وریای تاوانکردن بە، هیچ کات کەمتەرخەم نەبیت لێی. خوای گەورە لەبارەی ئەو کەسانەی بێ باکانە تاوان دەکەن و گوێیان لێ نییە و بە بچووك تەماشای دەکەن، دەفەرموێت: ﴿وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ﴾ النور:١٥. واتە: (ئێوە وا دەزانن شتێکی سادە و ئاسانە، بەڵام لای خوا زۆر گەورە و نا قۆڵایە).

- پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەرزی کرد: فڵانە کەس زۆر نوێژخوێن و ڕۆژووگرە، بەڵام ئازاری دراوسێکانی دەدات بە زوبان. فەرمووی: لە ئاگردایە.

ئەمجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فڵانە کەس ڕۆژوو و نوێژی کەمە، بەڵام خێر دەکات (سەدەقە) بە خواردن، ئازاری دراوسێ نادات. فەرمووی: ئەوە لە بەهەشتدایە). رواه احمد.

پێشتر له بەشەکانی تریشدا باسی ئەو فەرموودەمان کرد پله و پێگەی ئەو کەسانەی پێغەمبەران و شەهیدان کەیف خۆشن پێیان.

- پیاوێك هاته خزمەتی پێشەوا عومەر (ڕەزای خوای لەسەر بێت) وتی: ئامۆژگاریم بکه

فەرمووی: نیعمەتەکانی خوا بپارێزه بەسەرتەوه له هەموو بارودۆخێکدا. لەیادت بێت خوای گەوره ئاگاداره پێت لەهەر حاڵێکدا بوویت. هەمیشه مردن و چوونه گۆڕت له بیر بێت لەهەر حاڵ و بارێکدا بوویت.

## ١٣. کاتەکانت بپارێزه و به زایەیان مەده:

ڕەحمەتی خوا له ئیمام (حەسەنی بەصری) که دەڵێت:

ئەی بەنی ئادەم تۆ چەند ڕۆژێکیت، هەر ڕۆژێك که دەڕوات و ئاوا دەبێت تۆ هەنێکت لێ دەڕوات، که هەنێکیشت ڕۆی دڵنیابه هەمووشیت دەڕوات و تەمەنت کۆتایی دێت.

ڕەحمەتی خوا برژێت بەسەر ئەوەدا وتی: (ئەرکەکان زیاترن له کاتەکان، یارمەتی کەسانیتر بده تا سوود له کاتەکانیان وەرگرن، ئەگەر کارێکت هەبوو به کورتی بەجێی بێنه).

هەروەها (حەسەنی بەصری) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (هەر ڕۆژێك هەڵدێت هاوار دەکات: ئەی نەوەی ئادەم، من خەلقێکی نوێم، بەسەر کردەوەکانتانەوه شاهیدم، جوان سوودم لێوەرگره، چونکه ئیتر ناگەڕێمەوه که ڕۆشتم، بۆت دووباره نابمەوه تا ڕۆژی قیامەت).

## ١٤. قورئان بخوێنە:

هەندێك لە خەڵكی گوێ گرتن لە گۆرانی و مۆسیقا لە پێشترە بۆیان.. یاخود بینینی فیلمێك. ئەگەر گوێبیستی قورئان خوێنێك بوون خۆیانی لێ لادەدەن و لایدەبەن، یان دەیكوژێننەوە تا بیخەنە سەر ئەو فیلم و زنجیرەی چاوەڕێی دەكەن، ئەی كەی كاتێك ئاوا تایبەت دەكەیت بۆ گوێ گرتن لە قورئان؟! لەوانەیە ڕۆژی چەندەها چیرۆك و ڕۆمان و هەواڵی هیچ و پووچ بخوێنیتەوە، ئەی كەی كاتێك تەرخان دەكەیت تا خوا پەرستی بكەیت و قورئان بخوێنیتەوە كە خێر و پاداشتێكی زۆری هەیە، ئەوە ڕێگایە بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هەر كەسێك قورئان بەهاری دڵی بێت، پاك كەرەوەی چاو و گوێی بێت، پاراوكەری زمانی بێت، ئەوا هیدایەت دراوە بۆ سەر ڕاستە ڕێگا.

تا مسوڵمان چاو و گوێی لەدەست دەدات و هەموو گیانی لەكار دەكەوێت دەڵێ: (ئەگەر هەر ئیرادەم بمێنێت بەسمە)، بەڵام ئێمە وەك مسوڵمان (ئەگەر تەنها نیعمەتی ئیمان و عەقڵمان بمێنێت بەسمانە)، كەواتە سوپاسگوزاری خوا بە لەسەر ئەو نیعمەتانەی ئەم نزایە بخوێنە: (اللهم ألهمني الصَبْرَ وَ القُدرة لأرْضي بما ليْسَ منهُ بُدٌ،وَ ألهمني الصّواب و الحكمَة لأفرق بَيْنَ هذا و ذاك...(هذا وذلك). واتە: نێوان ئەوەی ڕازی بم پێی یان بیگۆڕم).

– ئەگەر بینیت ئافرەتێك پابەندە بە دینەوە خۆشەویستی بۆ دەربڕە و بیكە بە هاوڕێی خۆت، ئەو خۆشەویستییە (لە پێناوی خوا)

لای پەروەردگار پلە و پایەی زۆر بەرزی هەیە (پێشتر فەرموودەکانمان باس کردووە).

– هەمیشە دەستی پاڕانەوە بۆ خوا بەرز بکەرەوەو داوای لێخۆشبوون و چاك بوون و سەرکەوتن لە دونیا و دواڕۆژی لێ بکە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: واتە: (خوای پەروەردگارتان زیندوو بەخشندەیە، شەرم دەکات بەندەکەی دەستی بەرزبکاتەوە بۆی و بە بەتاڵی بیگێڕێتەوە). رَواهُ إبن ماجه.

– پەلە مەکە لە گیرابوونی نزاکانت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (هەر بەندەیەك دەستی بەرز کردەوە و داوای لە خوا کرد، هەر خوای گەورە نزاکەی قبوڵ دەکات داواکارییەکەی جێبەجێ دەکات مادام پەلە نەکات، وتیان ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، یانی چۆن پەلە نەکات، فەرمووی: ئەگەر بڵێ ئاوا نزام کرد داوام لێکرد هیچی نەدامێ).

دەبێت بەڕاستی ڕووبکەیتە خوا و دڵنیابیت کە نزاکەت گیرا دەبێت، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (داوا لەخوا بکەن و دڵنیا بن گیرا دەبێت، بزانن خوای گەورە ئەو نزایە قبوڵ ناکات کە لە دڵێکی بێ ئاگا و سەرقاڵ و ئالودەوە بێت).

– ئامان سەرپێچی لە فەرمانی خوا غەڕا و سەرگەردانتان نەکات. دواتر کەمتەرخەمی بکەن لە پیادەکردنی شەرعی خوا، بزانن کە ڕۆژێك دادێت ستەمکاران پەنجەی خۆیان لە پەشیمانیدا دەگەزن و دەڵێن: ﴿يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا﴾ الفرقان:٢٧.

واتە: (هەر ئەو ڕۆژە ستەمکار قەپ بە دەستی خۆیدا دەکات و دەڵێت: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێبازی ئیمانم بگرتایە). ﴿يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ ٢٥ وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ ٢٦﴾ الحاقة:٢٥-٢٦.

واتە: (ئەوەی نامەی کردەوەکانی بەدەستی چەپ وەردەگرێت دەڵێت: خۆزگە نامەی کردەوەکانم هەر وەرنەگرتایە و نەمزانیایە حیسابم چۆنە).

- شانازی بە دینەکەت و بیر و باوەڕتەوە بکە، تۆ ڕێزلێگیراو و سەربەرزیت لای خوای گەورە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ آل عمران:١٣٩. واتە: (هەر ئێوە سەرفراز و سەربەرز دەبن ئەگەر ئیمانداری ڕاستەقینە و چاکبن)

- وریابە لە لاساییکردنەوەی دابونەریتی بێ باوەڕەکان، خۆت جیاکەرەوە بە دینەکەی خۆت و جیاواز بە لەوانی دی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (مَنْ تَشَبَه بقومٍ فَهوَ منهُم).أبو داود

واتە: (هەر کەس خۆی بە تاقمێك یان قەومێك بچوێنێت ئەوا دەبێتە یەکێك لەوان). ئیتر ئەو قەومە بێ باوەڕ بێت ئەوا بزانە کاتێك تۆ خۆت وەك ئەوان لێ دەکەیت ئەوا دەبیتە ئەوان.

- ئەو گوناهو تاوانانەی دەیکەیت بیری لێ بکەوە، خوای گەورە و بەدەسەڵات دەتوانێت بە ئان و ساتێك هەموو ئەندامەکانت لێ بسەنێتەوە، بڕۆ سەردانی نەخۆشخانەکان بکەو تەماشای حاڵی ئەو ژنانە بکە کە نەخۆشن و لەشساغییان لەدەست داوە. لەوێ تەماشای

ئەو کچانە بکە لە تەمەنی لاویدان و هەیانە تەنها دەتوانێت چاوەکانی بجولێنێت.. ئەندامەکانی تری تووشی ئیفلیجی بووە، ئەگەر بە چەقۆ قاچ و دەستی ببڕێتەوە هەستی پێ ناکات، پێشتر ساغ بوون و ئێستا ئاواتەخوازی ئەوەن بتوانن دەسەڵاتیان هەبێت بەسەر خۆیاندا و بتوانن سەرئاوێکی ڕێك و پێك بکەن.. وەکوو منداڵ دایبیان پێ هەڵدەگیرێت. ئەوانیش وەك تۆ دەیان خوارد و دەیان خواردەوە، پێدەکەنین، یارییان دەکرد، بە بازاڕ و سەرشەقامیدا بە قاچەکانی خۆیان پیاسەیان دەکرد، لەپڕ بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل، یان جەڵتەی دەماغ، وایان لێ بەسەرهاتووە. لە ئاکامدا زیندوویەك مردووە ئایا ١٠ ساڵ بێت ٢٠ ساڵ بێت وەها دەمێننەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَـٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾ الأنعام:٤٦. واتە: بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە هەر کەس تووشی نەخۆشی یان بەڵایەك هات ئەوە سزای خوایە.. نا. دەبێت بێ خەم نەبین لە تۆڵە و بەڵای خوا، تەنها خەسارۆمەندەکان بێ خەمن لە تۆڵەی خوایی.



## ١٥. چۆك دامەدە لەبەردەم خەم و خەفەتەكانت:

هیچ لەوە قورستر نییە خۆشەویستێكت لەدەست بدەیت، مردن جیاوازی ناكات لەنێوان منداڵ و گەورە و بچووكدا، نە لەنێوان هەژار و دەوڵەمەندا.

ئاگاداری بیرەوەرییەكانت بە، ئەوانە هەر دەتگرن و بەرەو دواوە دەتبەن، هەرگیز ڕادەستی خەم و خەفەت مەبە دوای لەدەستدانی خۆشەویستێكت، یان نزیكێكت.

بیر لەوە بكەرەوە هیچ شتێك بەقەد خەمی لەدەستدانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قورس و گەورە نەبووە بۆ سەر مسوڵمانان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مسوڵمانان بەردەوامبوون لە گەیاندنی پەیامەكەی، لەدوای وەفاتی خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) تەسلیمی خەم و دڵ تەنگییەكەیان نەبوون، بەڵكوو چرای ڕێنمایی و هیدایەتیان هەڵگرت بۆ هەموو جیهان، فەتحی دونیایان كرد بۆ بەردەوامی و نەپسانی بانگەوازەكەی محمد (صلی الله علیه وسلم).

دۆخە سەختەكان لە بەرژەوەندی خۆت بگۆڕە، لەوانەیە ئازار و ناڕەحەتییەك بێت بۆ ئەوەی داهێنان و تازەگەرییەك لەتۆدا بتەقێنێتەوە و بە زیندوویی بمێنێتەوە.

خەمەكانت بقۆزەرەوە وەك هەلێك كە لە ڕێیانەوە وزە و بەهرەكانت بەدەرخەیت و تازەگەرییان پێ بكەیت، بگەڕێ لە دەروونی خۆتدا چ بەهرەیەك حەشاردراوە دەری بهێنە.

ئازار و مەینەتی خەڵکیت لەبیر بێت و دەستی یارمەتی بۆ هەژار و لێقەوماوان درێژ بکە، دڵت پەیوەست مەکە بەهیچ بەندە و مەخلوقێکەوە کە نەتوانی لێی دووربکەویتەوە، چونکە هەر دەبێت دوور بێت یان مردن و جیابوونەوە ڕوودات.

سوپاس و ستایشی خوا بکە لەسەر کارەساتەکان کە دەبوو موسیبەتێکی گەورەتر و ناخۆشتر بوایە، ڕەزای خوا لە ئیمامی عومەر کە دەفەرموێت: هەر موسیبەتێکم تووش بووبێت سوپاسی خوام کردووە لەسەر چوار شت:

١. ئەوەی موسیبەتەکە لە دینەکەمدا نییە.
٢. خوای گەورە لەسەری ئاسان کردووم.
٣. پەروەردگار ئارامی پێ بەخشیوم لەسەری.
٤. پاداشتم دەداتەوە لەسەری لە ڕۆژی قیامەتدا.

## ١٦. چۆن لە خەمۆکی ڕزگارم بێت؟

شتێکی ئاساییە هەستی خەمۆکی لەتەمەنی لاویدا زیاد بکات، چ کەسێک هەیە بە قۆناغی خەم و نەهامەتی و تێکشکاندا تێنەپەڕی بێت؟ بەڵام:

- بزانە هیچ شتێك لە دونیادا بەردەوام نابێت و هەمیشەیی نییە، نە خەم و خەفەت هەتا هەتاییە.. نە خۆشی و بێ خەمی.. ئەگەر لەو تەمەنەدا هەستت بە خەمۆکی شکستی دەروونی کرد، دڵنیابە خوای

گەورە بە نزا و پاڕانەوە و پەنابردن بۆی هەموو سەختی و ناڕەحەتییەکانت لا دەبات.

- دەبێت لەیادت بێت کە خەمۆکی تەنها تووشی تۆ و هاوتەمەنی تۆ نابێت، گەورە بچووک بەتەمەن منداڵ هەندێك جار تووش دەبن، بەڵام کارکردن و خۆ خەریککردن بە ئیشێکەوە ئەو هەستەیان دەشارێتەوە، تۆش هەوڵ بدە کاتەکانت بە شتی بەسوودەوە ببەیتە سەر و بەتاڵ نەبیت.
- دڵنیابە هەر خەم و سەختییەك تووشت دەبێت پاداشتی لەسەر وەردەگریت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (هەر دەرد و ئازار و خراپە و خەم و ناڕەحەتییەك تووشی مسوڵمان دەبێت تەنانەت دڕکێك بچێت بەپێیدا پاداشتی لەسەر وەردەگرێت و تاوانی پێ دەسڕدرێتەوە). رَواهُ البُخاري.

ئەوانەی ئارام دەگرن لەسەر ئەو ئازار و خەمانە خۆشەویستترین بەندەن لای خوا، کەواتە نائومێد مەبە؛ هیوا بڕاو مەبە، خوای گەورە باشترین پاداشتت دەداتەوە لەسەر ئەو ئارام گریەت.

- زۆر یادی خوا بکە، بەیادی خوا دڵەکان ئارام دەبنەوە و خەمەکان نامێنن، ئەو نزایەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڵێ: (اللهم إني أعُوذُ بِكَ مِنَ الهَمِ وَالحَزَن، وَالعجزِ وَ الكَسَل، وَالبُخلِ وَالجبن وَ ضَلَع الدين وَغَلبة الرجال). رَواهُ البُخاري.
- لەگەڵ ئەو کچانەدا هاوڕێیەتی بکە کە زۆر پابەندن بە دینەوە.. لەدەوری خۆت کۆیان بکەرەوە بیانکە بە پەرژینی شەیتان بۆ

خۆت، تا بەهۆی هاودەمی ئەوانەوە دوور بیت لە شەیتان و کاری خراپە.

- بگەڕێوە بۆ لای ئەو خۆشەویستەی کاتێك دونیا تەنگ دەبێت لێمان هاواری بۆ دەبەین، پەنا بگرە بە خوا، بووەستە لەسەر سەرزەنشتەکانی، لێی بپاڕێرەوە تا ڕێنماییت بکات بۆ ڕێگای ڕاست. خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ النمل:٦٢. واتە: ( ئایا جگە لە (زاتی پەروەردگار) کەبێت بە هانا و هاواری لێقەوماو و بێ دەرەتاو دالدەوە (کەسیتر هەیە) کاتێك کە نزا دەکات و لێی دەپاڕێتەوە ئەوسا بەڵام ناخۆشییەکان دەبات و دەتانکاتە نیشتەجێ و جێنشین لە زەویدا، ئایا ڕەوایە لەگەڵ ئەو زاتەدا خوای تر هەبێت؟!)



## وەرزی حەڤدەیەم تۆ بانگخوازیت:

ئاینی پیرۆزی ئیسلام تەنها لەسەر پیاو نەوەستاوە ئەرکی بانگخوازی لەسەرشان بێت، بەڵکوو بەشێك لەو بەرپرسیارێتییەی خستۆتە سەر شانی ئافرەتانیش، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤﴾ آل عمران:١٠٤.

واتە: (دەبێت ئێوە هەموو ئوممەتێك پێکبهێنن کە بانگەواز بکەن بۆ خێر و چاکەو فەرمان بکەن بەهەموو کارێکی دروست، قەدەغەی هەموو خراپەو نادروستییەك بکەن، هەر ئەوانەش سەرفرازن).

لە قورئانی پیرۆزدا بە دەقی (نص)ی ئاشکراو ڕوون بەرپرسیارێتی بانگەواز خراوەتە سەرشانی ئافرەت: ﴿وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾ الأحزاب:٣٢. واتە: (هەمیشە و بەردەوام قسەی چاك و بەجێ بکەن).

بێگومان بۆ خەڵکییە قسەی چاك و بەجێ و ئەوەش بانگەوازە، چونکە ئافرەتێك لەگەڵ ئافرەت ئاسوودەیە پرسیاری شەرعی لێ بکات، یان هەر شتێکی تری تایبەت بە ئافرەتان تاوتوێ بکات لەگەڵی، لەوانەیە شەرم بکات ئەو شتانە بە پیاو بڵێت.

پێشەوا (ابن العربی) دەڵێت: (خوای گەورە فەرمانی کردووە بە هاوسەرانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، تاوەکوو خەڵکی ئاگادار بکەن لەو فەرمانانەی لە قورئاندا هاتووە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وە ئەوەی دەیبینین لە کردار و گوفتاری خۆشەویستییان بگەیەنن بە خەڵکی، تا بیزانن و شوێنی بکەون).

### ١. سەرەتا خۆت پابەند بە:

پابەندبە بە شەرعی ئیسلامەوە، لە ژیانیشدا جێبەجێی بکە و کاری پێ بکە، بە کەسانی جگە لە خۆت بڵێ و بانگیان بکە، بەڵام پەلەیان لێ مەکە، چونکە کاتیش بەشێکە لە چارەسەرەکان.

وە پلەبەندیت هەبێت، واتە پلە بە پلە برۆ لەگەڵیان لە پەروەردە و فێرکردندا. خوشکەکەم زۆر وریابە لە زیادەڕەوی کردن لە شتێك لە ئەحکامەکانی ئیسلام.

فەرزەکان بەجێبهێنەو مەهێڵە بفەوتێن.. سوننەتەکان زۆر بکە، خۆت بە دووربگرە لە حەرامەکان و مەکروه و شتە گوماناوییەکان (کە یەکلا نەبوونەتەوە)، لە ناخ و ڕواڵەتدا پاك و لە خوا ترس بە.

هەرکات تووشی تاوان، یان کەم تەرخەمییەك بوویت، خێرا بە پەشیمانی پەنا بۆ خوا بەرەو تەوبە بکە، بە گریانەوە داوای لێخۆشبوونی لێ بکە، دڵنیابە خوای گەورە لێخۆشبوو لێبووردە و بەخشندەیە، بەردەوام ڕێگای بەرەو خودا بەهەموو دڵسۆزی و ڕاستگۆیی و بێ ڕیاییەوە بگرەبەر.

## ٢. ئامانجت لە ژیان:

لە ژیانتدا ئامانجێك دیاری بكە و هەوڵبدە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، پرسیار لەخۆت بكە، چیت دەوێت لە ژیان؟

- پارە و سامان؟
- گەنجێكی شۆخ و شەنگ؟
- سەرسامی خەڵكی پێت؟
- سەركەوتنی لە خوێندن و سەلماندنی بوونی خۆت؟
- خوای گەورەت دەوێت؟!

ئەم ئوممەتە پێویستی بە دایكانە، با هیوا و ئومێدت ئەوە نەبێت كە گەنجان پێت سەرسام بن و شەیدای بن.. با لەوانە نەبیت كە بەرزترین هیوا و ئاواتیان ئەوەیە كوڕێك لەسەرە ڕێگادا قسەی فریودەریان بۆ بكات، ببە بەو دایكانەی جوانترین جوانكاری و ڕازاندنەوەی دەم و چاویان لە ئاوی دەستنوێژەكانیان دەبینن.. شەرم و حەیا جوانترین شێوازی ڕەفتاریانە.. خۆداپۆشین لە جلوبەرگیاندا جوانترین خشڵە.

خوشكەكەم: بزانە ئەگەر خەڵكی سەرسامن پێت، سەرسام دەبن بەو جوانییانەی خوای گەورە تیاتدا دروستی كردووە و لە ناختدا حەشاردراوە. بەچاوی گومانـاوی و ڕەشبینی تەماشای دەوروبەرت مەكە، ئەوكات ڕەشبین دەبیت و تووشی تێكشكان دەبیت. مەڵێ: ئەم كۆمەڵگەیە دواكەوتووە و دوورە لە ئیسلامەوە و نە خێری تیایە نە هیوا.



ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە بە بیرخۆت بهێنەرەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ١٠٣﴾ یوسف:١٠٣. واتە: (دڵنیابە کە زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناهێنن، هەرچەندە تۆ زۆر بە تەنگەوە بیت و هەوڵ بدەیت و بکۆشیت).

## ٣. کچێکی مسوڵمان و جیاوازبە:

لەوانەیە ئێستا لە قۆناغی زانکۆ، یان نزیك لەوە بیت، ئەو قۆناغەی کەسێتیت تێیدا بەدەر کەوێت و جیابکرێتەوە:

- سەرەتا متمانەت بەخوا هەبێت، پاشان بەخۆت، بەڵام بێ غرور و لەخۆبایی بوون.
- بەتوانا بە لە چەسپاندنی کەسێتیت، بەڵام بەبێ دەمارگیری و لاساری و کەلە ڕەقی، یان خۆ گەورە کردن.
- هەست و سۆزت بگرە، بەڵام بەبێ زۆر لەخۆکردن و زۆرکاری.
- شوێن ئارەزووەکانی نەفست مەکەوەو هەرچی ویست بیکەیت! یان هەر خەونێکی بوو بیهێنیتە دی!
- نەفس حەزی بە گاڵتە و گەپ و تەمبەڵییە.. تەمەڵ مەبەو خەمسارد و کەمتەرخەم مەبە لەو کارانەی حەز و خواستت پێیان هەیە. نەفس حەزی بە فیز و خۆشەویستی ڕواڵەتە.
- بە داناییەوە خەرج بکە و جلوبەرگێك لەبەربکە، زیادەڕۆیی خەرجی تیا نەبێت و خەیاڵی نەبێت.

- هەروەها نەفس حەزی بە نەوسنی و چڵێسی و خواردن و خواردنەوەی خۆشە، زیادەڕۆیی مەکە لە خواردندا. کێش و لەش جوانیت بپارێزە.
- خۆت بە بیر و باوەڕ پڕ چەك بكە تا خواست و ئیرادەت بەهێز بێت، زاڵ بە بەسەر لاوازی ئارەزووەكانی نەفسی سەرپێچكارت.
- هەركاتێك كەسیك ڕای تۆی ویست و پرسی پێ كردیت بۆ كارێك و بێ دەنگ گوێیان لێگرتی، ئەوا (بە ئیزنی خوا) پەسەندێتی و جیاوازیت بەدەست هێناوە بەسەریاندا، (كەواتە سوپاسی خوا بكە بۆ ئەو نیعمەتە، وە بیپارێزە بە زیادكردنی زانیاری و ڕۆشنبیریت.. ئەو زانیاری و چاكەی كە هەتە بڵاوی بكەرەوە بە خوشك و هاوڕێكانت. تۆ لەو تەمەنەدا لە تەمەنی بەخشین و دڵ فراوانیدایت، پاداشتەكەت لای خودا هەژمار دەكرێت و چاوەڕێی زاتی الله بە بۆ پاداشتەكەی.

## ٤. ئێمە لە گۆڕەپانی جەنگداین بۆ گۆڕانكاری

ئاسنگەر لە پارچە ئاسنەكە دەدات و ئازاری پێ دەگەیەنێت، تا بیكاتە ئامڕازێكی بەرهەمداری باش و بیكاتە دەڤەری ژیان. دارتاش دار و تەختەكە هەڵدەكۆڵێت، زۆری لێ لادەبات و فڕێی دەدات لەپێناو ئەوەی جوان بێت و شتێكی بەسوود و جوانی لێ دروست بكات.

هەروەها بانگخوازیش لە ژن و پیاو ئەندازیاری ژیانن.



- مەبەستی قورئان تێبگە، دووره پەرێز مەبە لە خەڵکی، هەر کە ئایەتێکت خوێندەوە وەك: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ﴾ المائدة:١٠٥. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشە و بەردەوام سەرگەرمی پەروەردەی خۆتان بن (مەترسن)، چونکە ئەوانەی گومڕان ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن، ئەگەر ئێوە بەچاکی ڕێبازی هیدایەت و خواناسیتان گرتبێتەبەر).

پێویستە بزانیت هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە چییە؟ ئەو حاڵ و بار و سەردەمی هاتنە خوارەوەکەی چۆن بووە؟ ئەمە تەنها نموونەیەکە بۆ ئایەتەکانیتر.

- لە قسەکانتدا هەوڵ بدە زۆر بەڵگەی ئایەتی قورئان بەکاربهێنیت، لەبری ئەوەی چیرۆك و بەسەرهاتی گێلانە و سادە باس بکەیت لە ژیانی خەڵکی ئاسایی و مێژوو.

چیرۆکی بەسەرهاتەکانی ناو قورئان بگێڕەرەوە.. مەبەستەکانیان ڕوون بکەرەوە.. لە بری ئەوەی پەندی پێشینانی دەشتەکی و ئەفسانەیی بگێڕیتەوە، بگەڕێ و هاوشێوەکەی لە قورئاندا دەربهێنە و باسی بکە.

## ٥. ڕێگای بانگخوازی

قسەڕەق مەبە، بوێرێتی لە پیشاندانی حەقدا مەکە بەوەی خەڵکی ڕقیان لێت هەستێت و دڵیان بگۆڕێت بەرامبەرت. نەرم و نیان بە، دانا و

کارامه به لەگەڵ ئەوانەی مامەڵەیان لەگەڵ دەکەیت. بۆنەکان هەڵبژێرەو بیکه به هەلێك بۆ ئاراسته کردن و گەیاندنی پەیامەکەت تا کاریگەرتر بێت.

وَأخِرُ دَعوانا أن ألحِمْدُلله رَب العالِمين

❊❊❊



# کورتەیەك لە ژیانی نووسەر

# دکتۆر حەسان شەمسی پاشا

لەساڵی ١٩٥١ لە دایك بووە، ساڵی ١٩٧٥ کۆلێژی پزیشکی لەشاری حەلەبی سوریا تەواو کردووە، پسپۆڕی وەرگرتووە لە نەخۆشییەکانی دڵ لە وڵاتی بەریتانیا، زیاتر لە ١٠ ساڵ ماوەتەوە و کاری پزیشکی کردووە. ئەندامی کۆمەڵەی پزیشکانی دڵی ئەمەریکییە، ئەندامی کۆمەڵەی پزیشکانی دڵی بەریتانییە، ئەندامی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی نەخۆشییەکانی خوێنە. ئەندامی چەندین کۆمەڵەی دیکەیە.

ئەندامی پسپۆڕە لە کۆمەڵەی (فیقهی ئیسلامی نێودەوڵەتی).

ڕاوێژکارێکی سەرەکی کۆمەڵێك گۆڤاری پزیشکییە.

ناوی چووەتە فەرهەنگی ئینگلیزی (who is who) بۆ پزیشکە بەناوبانگەکانی جیهان لە ساڵی ٢٠٠١.

دووبارە ناوی چووەتە فەرهەنگی ئینگلیزی (who is who) بۆ پزیشکە بەناوبانگەکانی جیهان لە ساڵی ٢٠٠٢.

زیاتر لە ٥٠ کتێبی نووسیوە لە بوارەجیاوازەکانی پزیشکی و پەروەردەیی و مێژوویی بەزمانی ئینگلیزی و عەرەبی. سێ کتێبیان باسی نەخۆشییەکانی دڵە بە زمانی ئینگلیزی نووسیویەتی.

# ناوەڕۆك

## وەرزی دووەم

## ئافرەت لەسەردەمی ئیسلامدا



## وەرزی سێهەم

## ڕەوشتی کچی ئیماندار:

## وەرزی چوارەم

## تۆ و ڕۆشنبیرییەکەت



## وەرزی پێنجەم

## تۆ و حیجاب (بالاپۆشی)



## وەرزی شەشەم

## چۆن وتویێژ لەگەڵ دایك و باوکت دەکەیت





## وەرزی حەوتەم

## تۆ و هاوڕێکانت



## وەرزی هەشتەم

## تۆ و کوڕە گەنجەکان

## وەرزی نۆهەم

## وریابە لە تێکەڵی نامەحرەم



## وەرزی دەیەم

## خۆشەویستی ڕاستەقینە:

وەرزی یانزەیەم

لەسەر ڕێی دەستگیرانیدا



وەرزی دوانزەهەم

لە دەروازەی چوونە نێو کەژاوەی هاوسەرگیریدا



وەرزی سیانزەهەم

کارکردنی ئافرەت

## وەرزی چواردەهەم

## ئافرەت و چوونە بازاڕ



## وەرزی پازدەهەم

## ئافرەت لای ئێمە و لای ئەوان

## وەرزی شازدەهەم

## بەرەو باوەڕێکی زیاتر




بەڵێ لە ڕێگای ئەم کتێبەوە، دەمەوێ وەڵامی زۆرێك لەو پرسیارانە بدەمەوە کە مێشکی کچانی سەرقاڵ کردووە، تاوەکو ئاگاداریانکەم لەو مەترسییانەی لە هەموو لایەکەوە دەورەیداون، لە گەنجی بەدڕەوشت و نالەبار لە ڕاگەیاندن و میدیای ڕوخێنەر و تێکدەر، لە تەڵە و پیلانی ناحەزە ساختەچییەکان لە هەموو لایەکەوە. تاوەکو باوەڕیان بەهێز بکات و دڵیان بەدینەکەیانەوە پەیوەست بکات..

گەشە
کتێبخانەی گەشەبۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ktebkhaney geshe
٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣
نرخ (٥٠٠٠)دینار